علي خان

# ئەمە ئیبن تەیمیەیە

## هەڵوێستی لەگەڵ نەیارەکانی لە گروپە ئیسلامیەکان، وجولەکە وگاورەکان ولەسەر پرسی تەکفیر

## وەڵامێك بۆ پلاتفۆڕمی دابڕان

# مافی لەبەرگرتنەوەی پارێزراوە بۆ نوسەر


| | |
|---|---|
| ناوی کتێب بە کوردی: | هەڵوێستی لەگەڵ نەیارەکانی لە جولەکە وگاورەکان وگروپە ئیسلامیەکان، ولەمەڕ پرسی تەکفیر |
| نوسەر: | عەلی خان |
| تایپ: | ژیلوان عەلی |
| نۆرە وساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٣٨ - ٢٠١٧ز |
| شوێنی چاپ | لوبنان |
| تیراژ: | ١٠٠٠ |

بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خوای خاوەن ڕەحمەتی ڕەحمەتکار

ئیبن تەیمیە: «ومن سنگم فراوانە بەرامبەر هەمو ئەوانەی نەیاری منن، با سنوری خواش بشکێنێ دەرحەقم بە تەکفیرکردنم یان تەفسیق کردنم یا درۆهەڵواسین بە دەممەوە یا دەمارگیری نەفامانە بکا لە دژم، بەڵام من سنوری خوای لە ئاست نابەزێنم، بەڵکو زەبتی ئەو قسە وکردارانە ئەکەم کە ئەنجامی دەدەم، وبە تەرازوی دادگەری دەیپێوم، ووای لێدەکەم شوێنی قورئان وسوننەت بکەوێ وچاو لەوان بکات». «مجموع الفتاوی» (٣/٢٤٥).

ئیبن حەجەری عەسقەلانی: «جا پێویستە لەسەر ئەوانەی بەرگی زانستیان پۆشیوە وعەقڵیان هەیە لە وتەکانی ئەم پیاوە تێڕا بمێنن ئەویش لە ڕێی کتێبەکانیەوە».

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# دەستپێك

ستایشی بێپایان وشایستە بۆ خوا، سەلام ودرود بۆ سەر خۆشەویست وخۆشەویستانی خوا، دوای ئەوە:

بێگومان باسکردن لەبارەی ئیبن تیمیەوە رَحِمَهُ ٱللَّهُ باسێکی دور ودرێژ وتولانیە لە چەندین بوار وڕوانگەوە ئەکرێ قسەی لەسەر بکرێت، ئەوەی من ئەمەوێ لەم کتێبەدا باسی لەبارەوە بکەم -بە پشتیوانی خوای پیرۆز وبەرز- بریتیە لە نەرمونیانی وئینصافی ئیبن تەیمیە ودوری ئەو لە تەکفیرەوە، ئەمەش بە ڕونکردنەوەی هەڵوێستی لەگەڵ نەیارەکانیدا؛ چی وەکو مەسەلەی ناو وحوکمەکان «الأسماء والأحكام»[1] وەکو تەفسیق وتەبدیع وتەکفیر وچی وەکو مامەڵەکردن وهەڵسوکەوت وهەڵوێستی خۆی لەگەڵیاندا لە واقعی عەمەلیدا، واتە: هەم وەکو حوکمدان بە وتە وفەتوا؛ حوکمی چیداوە لەسەر نەیارەکانی؟ هەم وەکو هەڵوێستی کردەیی تەتبیقی چۆن بوە لەگەڵ نەیارەکانیدا.

ئەم بابەتەش لە بنەڕەتدا، بریتیە لە وانەیەکی نزیك کاتژمێر ونیویی پێشکەشکراوە دوای بەستنی کۆنفرانسێکی پلاتفۆڕمی دابڕان کە تێیدا

(١) ناوەکان وەکو: بڕوادار وبێبڕوا وفاسق «ئەوەی لە قسەی خوا دەردەچێ»، وحوکمەکان وەکو: تەکفیر وتەفسیق ...، یانی: حوکمدان بە بڕواداری یان بێبڕوایی یان فاسقی کەسێك.

هێرشی زۆر کرایە سەر ئیبن تەیمیە بە زمان وئوسلوبێکی دور لە زانست ومەعریفە وهەقویستی، بەڵکو بە زمانی ڕق وکینە وبڕیاری پێشوەختە. لەو وانەیەدا ئەم لایەنەی ژیانی ئیبن تەیمیەمان وەرگرت وخستمانە ڕو وپاشان ڕاستەوخۆ ئەو برایانە «ژیلوان عەلی وئەوانی تریش» -جزاهم الله خیرًا- هەستان بە نوسینەوەی، ماوەیەکی بەسەر چو تا -الحمد لله- دەرفەت ڕەخسا بۆ پێداچونەوەی ودوای پێداچونەوەیی ودەستکاریکردنی ئەمەی بەردەستی لێدەرچو.

سەبارەت بە ئین تەیمیە: ئێمە بە فەزڵی خوای گەورە هەر لە سەرەتای پابەندبونمانەوە بە دینداریەوە ئاشنای ئەم پیاوەین وسەرەتاش ئیبن قەییمی قوتابی. وبەشێکی باشی کتێبەکانیانم خوێندۆتەوە والحمد لله[(١)]، وشارەزای باشیانم کە چەند مونصیف ودادگەر ومایانڕە وبۆ خوا سولحاو ونەرم ومیهرەبان بون، بەڵێ مرۆڤن وهەڵەشیان هەیە وچاکەشیان هەیە وەك هەر مرۆڤێکی تر، بەڵام تۆمەتبارکردنیان بە سەرچاوەی تەکفیر لە ستەمترین ستەمەکانە، بە تایبەت ئەگەر بە ناوی لێکۆڵەر وتوێژەر وزاستەوە بکرێ ئەوە گەورەترە.

---

(١) جا خوای میهرەبان بە فەزڵی خۆی ئەوانی کردە هۆکار بۆ هەڵبژاردنی ئەم شێوازی دینداریە کە لەو کاتەوە تا ئێستا لەسەریم ولێی دەپاڕێمەوە بە میهرەبانی خۆی بەردەوامان بکات لەسەری تا دەگەینەوە بە دیداری بەرز وجوان وپڕ شکۆمەندی.

منیش وەك توێژەرێك وئەكادیمیەك وهەقویستێك لەم كتێبەی بەردەستت گـــوزەرێكی خێرامـــان كـــردوە بـــە نـــاو كتێبـــەكانی ئـــیبن تەیمیـــەدا، وتـــە وهەڵوێستەكانی بەرامبەر نەیارانی تێـدا هەڵبـژێردراوە. لەگـەڵ هەڵوێســتی بەرامبەر تەكفیر وتەبدیع وتەفسیق، تا بـۆت ڕون بێتـەوە ئـەو برادەرانـە بـە تەئكید كتێبی ئیبن تەیمیەیان نەخوێندۆتەوە وتەنها وەك توتی قسەی خەڵكی تر دوبارە دەكەنەوە.

علي خان

مزگەوتی قازی محمد -بە ڕەحمەت بێت-

سەرەتای ڕەمەزانی ١٤٣٨ - ٢٠١٧

# ناڕەحەتیەکانی سەر ئیبن تەیمیە

ئیبن تەیمیە رَحِمَهُ ٱللَّهُ چەندین جار ڕوبەڕوی میحنەت وناڕەحەتی بۆتەوە، چونکە لە شامدا ناو وناوبانگی گەورەی هەبو چ لەلای خەڵك وچ لەلای دەسەڵاتداران وچ لەلای زاناکان، جا بەهۆی نوسینی چەند کتێبێك وبڵاوبونەوەی چەند فەتوایەکەوە، ناڕەحەتیەکان دەستیان پێکرد، واش ئەزانم یەکەمجار بەهۆی نوسینی کتێبی: «العقيدة الحموية» یان «الفتوى الحموية» بو لەساڵی ٦٩٨[1]، ئیتر قازی حەنەفیەکان فەرمان دەکات لە شارەکان جاڕ لێبدرێت کە بیروباوەڕی ئیبن تەیمیە پوچە، پاشان فیتنەیەك بەو هۆیەوە دروست دەبێت، ئینجا ئیبن تەیمیە لەگەڵ قازی شافعیەکان دادەنیشێت وعەقیدەکەی دەخوێننەوە کە دانیشتنەکە تەواو دەبێت، قازی شافعیەکان ئەڵێ: هەرکەس قسە بە شێخ بکات ئەبێ تەمبێ بکرێت[2].

پاشان بەهۆی کتێبی: «العقيدة الواسطية»ەوە دیسانەوە ناڕەحەت کرایەوە، وبە مەرسومێکی سوڵتانی هەمو فەیقیە وزاناکان کۆکرانەوە بۆ موناقەشەکردنی عەقیدەی ئیبن تەیمیە وزیرەکترین کەسیان هەڵبژارد بۆ ئەو مەبەستە بەڵام دەرەقەتی ئیبن تەیمیە نەهات وجۆگەکەی تێکەڵی بەحرەکەی ئەم بو[3].

---

(١) ئەم کتێبەش کۆمەڵێك دوژمنی بۆ دروستکرد لە ئەهلی کەلام وکۆمەڵێك لە خاوەن مەزهەبەکان کە کاریگەر بون بە ئەهلی کەلام وعەقیدەیانەوە .

(٢) «البداية والنهاية» (١٤/٤) و«العقود الدرية» (ص ٢٠١ - ٢٠٢).

(٣) «البداية والنهاية» (١٤/٣٦).

ئینجا لە دانیشتنێکی تر کەسێکی تریان هەڵبـژارد وئـەمیش کۆتـایی هات بەوەی عەقیدەی ئیبن تەیمیــە وەرگـیراوە وتــەواوە، ئـەویش بـە خۆشـی وسەربەرزی گەڕایەوە ماڵی خۆی.

پاشان دانیشتنێکی تـر کـرا لـە سـەر داوای قـازی «ئـیبن مـەخلوف» و«نەسری المنبجی» چونکە دەرەنجامی دانیشتنەکانی پێشویان بـە دڵ نـەبو. بۆیە هەر لەسەر داواکاری ئەو دو کەسە وبە فەرمانی سوڵتان، ئەبوایە بڕوات بۆ میسر، ئەویس ساڵی ٧٠٥ بەرەو میسر کەوتە ڕێ.

لەوێ هەمو زانا وفەقیهەکان کۆکرانەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە عەقیدەی ئیبن تەیمیە، ئیبن تەیمیە بینی حاکمەکە ئیبن مەخلوف خۆیەتی رَحِمَهُ ٱللَّهُ، وتی: چـۆن ئەکرێ دو لایەنە ناکۆکە لایەکیان قازیەکە بن؟! ئەوەبو ڕازی نـەبو، ئـەویش مەرسومێکی دەرکرد وخستیە زیندانەوە، تا ساڵی ٧٠٧.

دوای دەرچونی سۆفیە تیژەکانی ئـەوێ هاواریـان لـێ هەسـتا، ئـەوەبو سەرپشك کرا لە نێوان مانەوە لە زیندان یان گەڕانەوە بۆ دیمەشق یـا ڕۆیشـتن بۆ ئیسکەندەریە. ئەو سەرەتا زیندانی هەڵبژارد بەڵام لەسەر داواکـاری زۆری دۆستانی، گۆڕی بۆ گەڕانەوە بۆ شام. جـا هێشـتا لـە میسـر بـە تـەواوەتی دەرنەچو بو، نوێنەری سوڵتان هات وپێی ڕاگەیاندن تەنها یـەك هەڵبـژاردەت لە بەردەمدایە؛ ئەویش: زیندانە.

ماوەیەك مایەوە لە زیندان پاشـان دەرکـرا، دوبـارە دەسـتیکردەوە بـە وانەکانی.

پاشان ساڵی ۷۰۹ نەفی کرا بۆ دیمەشق، پاشان حـەوت مـانگی پێنەچـو سوڵتان قەلاوون گەڕایەوە سـەر تـەخت، بۆیـە نـاردی بـە دوایـدا وئـەویش گەڕایەوە قاهیرە، چونکە قەلاوون خۆشی دەویست.

لەوێ قەلاوون ڕێزی زۆری لێـدەگرێ ولەبـەر پێـی هەڵدسـتێ ودەسـتی دەگرێت. پاشان پرسێك بە فەقیهەكان دەكات لەسەر بابەتێك كەسیان فزەیان لێوە نایەت، بەڵام ئیبن تەیمیە دەكەوێتە چۆكە وقسـە دەكـات ودەنـگ بـەرز دەكاتەوە بەسەریدا وئەوە دەڵێ كە ئەوان خەونیشی پێوە نـابینن وجورئـەتی ئەوە ناكەن، بێگومـان هەڵوێسـتی واش ڕق وكینـەی لـە دڵـی هەنـدێكیان دروستكرد كە وەك ئەویان پێناكرێ، والله أعلم[1].

(١) «البداية والنهاية» (٩٤/١٨) وتمام القصة فيه: «أَنَّ السُّلْطَانَ لَمَّا قَدِمَ عَلَيْهِ الشَّيْخُ تَقِيُّ الدِّينِ ابْنُ تَيْمِيَّةَ نَهَضَ قَائِمًا لِلشَّيْخِ أَوَّلَ مَا رَآهُ، وَمَشَى لَهُ إِلَى طَرَفِ الْإِيوَانِ، وَاعْتَنَقَا هُنَاكَ هُنَيْهَةً، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِهِ فَذَهَبَ بِهِ إِلَى صُفَّةٍ فِيهَا شُبَّاكٌ إِلَى بُسْتَانٍ، فَجَلَسَا سَاعَةً يَتَحَدَّثَانِ، ثُمَّ جَاءَ وَيَدُ الشَّيْخِ فِي يَدِ السُّلْطَانِ، فَجَلَسَ السُّلْطَانُ وَعَنْ يَمِينِهِ ابْنُ جَمَاعَةَ قَاضِي مِصْرَ، وَعَنْ يَسَارِهِ ابْنُ الْخَلِيلِيِّ الْوَزِيرُ، وَتَحْتَهُ ابْنُ صَصْرَى، ثُمَّ صَدْرُ الدِّينِ عَلِيٌّ الْحَنَفِيُّ، وَجَلَسَ الشَّيْخُ تَقِيُّ الدِّينِ بَيْنَ يَدَيِ السُّلْطَانِ عَلَى طَرَفِ طُرَّاحَتِهِ، وَتَكَلَّمَ الْوَزِيرُ فِي إِعَادَةِ أَهْلِ الذِّمَّةِ إِلَى لُبْسِ الْعَمَائِمِ الْبِيضِ بِالْعَلَائِمِ، وَأَنَّهُمْ قَدِ الْتَزَمُوا لِلدِّيوَانِ بِسَبْعِ مِائَةِ أَلْفٍ فِي كُلِّ سَنَةٍ، زِيَادَةً عَلَى الْجَالِيَةِ، فَسَكَتَ النَّاسُ، وَكَانَ فِيهِمْ قُضَاةُ مِصْرَ وَالشَّامِ، وَأَكَابِرُ الْعُلَمَاءِ مَنْ أَهْلِ مِصْرَ وَالشَّامِ، مِنْ جُمْلَتِهِمُ ابْنُ الزَّمْلَكَانِيِّ.

قَالَ ابْنُ الْقَلَانِسِيِّ: وَأَنَا فِي مَجْلِسِ السُّلْطَانِ إِلَى جَنْبِ ابْنِ الزَّمْلَكَانِيِّ، فَلَمْ يَتَكَلَّمْ أَحَدٌ مِنَ الْعُلَمَاءِ وَلَا مِنَ الْقُضَاةِ، فَقَالَ لَهُمُ السُّلْطَانُ: مَا تَقُولُونَ؟ يَسْتَفْتِيهِمْ فِي ذَلِكَ، فَلَمْ يَتَكَلَّمْ أَحَدٌ، فَجَثَا الشَّيْخُ تَقِيُّ الدِّينِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَتَكَلَّمَ مَعَ السُّلْطَانِ بِكَلَامٍ غَلِيظٍ، وَرَدَّ عَلَى الْوَزِيرِ مَا قَالَهُ رَدًّا عَنِيفًا، وَجَعَلَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ، وَالسُّلْطَانُ يَتَلَافَاهُ وَيُسْكِتُهُ بِتَرَفُّقٍ وَتَوَدُّدٍ وَتَوْقِيرٍ، وَبَالَغَ الشَّيْخُ فِي الْكَلَامِ، وَقَالَ مَا لَا يَسْتَطِيعُ أَحَدٌ أَنْ يَقُومَ بِمِثْلِهِ وَلَا قَرِيبٍ مِنْهُ، وَبَالَغَ فِي التَّشْنِيعِ عَلَى مَنْ يُوَافِقُ عَلَى ذَلِكَ، وَقَالَ لِلسُّلْطَانِ: حَاشَاكَ أَنْ

پاشان بەهۆی چەند فەتوایەکی لەسەر سێ تەڵاقە، وەك تەڵاقی سوێند، ئەگەر کەسەکە مەبەستی سوێند بێت، سوێندە، وسێ تەڵاقە بە یەك تەڵاق هەژمار دەکرێت، وتەڵاقی حەرام ناکەوێت[1]، ئەم فەتوایانە لە جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبویەوە وەك ئاگری ناو پوش وپەڵاش، ئەوەبو ساڵی ٧١٨ یەکێك لە زانا حەنبەلیەکان قسەیان لەگەڵ کرد کە واز لەم فەتوایە بهێنێت تا ئەو فیتنە وبەڵایە بەم هۆیەوە دروست بوە کپ ببێتەوە، ئەویش ڕازی بو. تا ساڵی ٧١٩ دیسانەوە گەڕایەوە بۆ ئەو فەتوایە. دیسانەوە لێی قەدەغە کرا، تا ساڵی ٧٢٠ سێبارە گەڕایەوە، ئیتر بەم هۆیەوە ڕێگری لێکرا لە فەتوادان وبەندیان کرد لە قەڵای دیمەشق تا ساڵی ٧٢١ بۆ ماوەی پێنج مانگ وچەند ڕۆژێك.

پاشان بابەتێکی تریان هێنایە پێشەوە ئەویش مەسەلەی زیارەتکردنی گۆڕی پەیامبەر بو ﷺ کە گوایە وتویەتی: تەنانەت نابێت زیارەتی هیچ قەبرێك بکرێت بە قەبری پەیامبەریشەوە ﷺ. بەو هۆیەوە ساڵی ٧٢٦ خۆی وکۆمەڵێك لە قوتابییەکانی خرانە زیندانەوە، تا ٧٢٨، ئیتر وەرقە وقەڵەم

---

يَكُونَ أَوَّلُ مَجْلِسٍ جَلَسْتَهُ فِي أُبَّهَةِ الْمُلْكِ تَنْصُرُ فِيهِ أَهْلَ الذِّمَّةِ لِأَجْلِ حُطَامِ الدُّنْيَا الْفَانِيَةِ، فَاذْكُرْ نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكَ إِذْ رَدَّ مُلْكَكَ إِلَيْكَ، وَكَبَتَ عَدُوَّكَ، وَنَصَرَكَ عَلَى أَعْدَائِكَ، فَذَكَرَ أَنَّ الْجَاشْنَكِيرَ هُوَ الَّذِي جَدَّدَ عَلَيْهِمْ ذَلِكَ، فَقَالَ: وَالَّذِي فَعَلَهُ الْجَاشْنَكِيرُ كَانَ مِنْ مَرَاسِيمِكَ؛ لِأَنَّهُ إِنَّمَا كَانَ نَائِبًا لَكَ، فَأَعْجَبَ السُّلْطَانَ ذَلِكَ، وَاسْتَمَرَّ بِهِمْ عَلَى ذَلِكَ، وَجَرَتْ فُصُولٌ يَطُولُ ذِكْرُهَا، وَقَدْ كَانَ السُّلْطَانُ أَعْلَمَ بِالشَّيْخِ مِنْ جَمِيعِ الْحَاضِرِينَ، وَبِعِلْمِهِ، وَدِينِهِ، وَقِيَامِهِ بِالْحَقِّ، وَشَجَاعَتِهِ» وسنذكرها إن شاءالله.

(١) هەڵبەت ئەمەش کۆمەڵێك دوژمنی لە فەقیهەکان بۆ دروست کرد.

وکتێبیشی لێسەندرا وڕێگری دیداری خەڵك ونوسینیشی لێکرا. ئەو ساڵەش کۆتا ساڵی تەمەنی بو وهەر لەوێدا سەری نایەوە، خوا لە ئێمە وئەو ونەیارانیشی ببورێت.

## کتێبەکانی ئیبن تەیمیە

هەر کەسێك بەچی ئەناسرێ؟ بێگومان بە شوێنەوار وئاسەوارە زانستیەکانی (کتێب ونوسراو وقوتابی وفێرخوازەکانی).

جا ئەگەر لە ئیبن تیمیە رَحِمَهُ ٱللَّهُ بڕوانی، دەبینی کتێب ونوسراوەکانی لەوە زۆرترن من بتوانم بیانژمێرم، بەڵکو بە کەس ناژمێردرێت -غالبًا- چونکە زۆر زۆرە لە قەبارە بچوك وگەورە کە لە وڵاتاندا بەربڵاوە، نەڕۆیشتۆتە شوێنێك مەگەر نوسراوێکی تێدا نوسیوە[1].

جا ئەوەی کە تا ئێستا چاپکراوە ئەگاتە ٣٠٠ سێ سەد بەرگێك، وئەوەشی دەستنوسە، ئەڵێن: نزیك ئەبێتەوە لە ١٠٠٠ هەزار دەستنوس.

جگە لەوە کتێبەکانی لە ئاستێکی بەرزی زانستی وردبینی وبەڵگە بەهێزی ونەفەس درێژیدایە، ولە هەر بابەتێك قسەی کردبێت ئەوپەڕی

---

(١) بڕوانە: «الأعلام العلية» (ص٢٣): «وَأما مؤلفاته ومصنفاته فَإِنَّهَا أكثر من أَن أقدر على إحصائها أَو يحضرني جملة أسمائها بل هذا لا يقدر عليه غَالِبا أحد، لأَنّها كثيرة جدًا كبارًا وصغارًا وهي منشورة في البلدان، فقلّ بلد نزلته إلّا ورأيت فيه من تصانيفه».

وردبینی تێدایـه، بۆیـه ڕایـەکی بـه پەسـەند زانـی بێـت دەبـینی زۆرجـار پەسەندە(١).

وشێخی ئیبن ڕەجەب رَحِمَهُ ٱللَّهُ ئەفەرموێ: «**وأمّا تصانيفه: فهي أشهر من أن تذكر، وأعرف من أن تنكر، سارت مسير الشَّمس في الأقطار، وامتلأت بها البلاد والأمصار، قد جاوزت حد الكثرة، فلا يمكن أحد حصرها، ولا يتسع هذا المكان لعد المعروف منها، ولا ذكرها**».

واته: «نوسراوەکانی لەوە بەناوبانگترە باسبکرێ، ولەوە ناسراوترە نکوڵی لێبکرێ، لە وڵاتان وەکو خۆر بڵاوبۆتەوە، وشار ووڵاتان پڕن لـە کتێبـەکانی، ئەوەندە زۆرن لە ژماردن نایەن»(٢).

وشێخی ئـیبن عەبـدولهادی رَحِمَهُ ٱللَّهُ ئـەڵێ -ناقلًا عن غيره-: «**لو أراد الشَّيخ تقيّ الدّين رَحِمَهُ ٱللَّهُ أو غيره حصرها (يعني مؤلفات الشَّيخ) لما قدرُوا، لأنَّه ما زال يكتب وقد من الله عليه بِسُرْعة الكِتَابة، ويكتب من حفظه من غير نقل**»(٣).

---

(١) «هكذا تحدث ابن تيمية» (ص٦) من مقدمة الشيخ زهير الشاويش.

(٢) «ذيل طبقات الحنابلة» (٤/٥٢٠)

(٣) «العقود الدرية» (ص٨٠) وتمامه: «وأَخبرني غير واحد أنه كتب مجلدًا لطيفًا في يوم وكتب غير مرّة أربعين ورقة فِي جلسة وأكثر وأحصيت ما كتبه وبيضه في يوم فكان ثمان كراريس في مسألة من أشكل المسائل وكان يكتب على السُّؤال الواحد مجلدا وأما جواب يكتب فيه خمسين ورقة وستِّينَ وأربعين وعشرين فكثير. وَكَانَ يكْتب الْجَواب فَإِن حضر من يبيضه وإِلَّا أَخذ السَّائل خطه وذهب. ويكْتب قواعد كَثِيرَة في فنون من العلم في الأُصُول والْفُروع والتَّفْسير وغير ذلِك فإِن وجد من نقله من خطه وإِلَّا لم يشْتَهر ولم يعرف ورُبما أخذه بعض أصحابه فلا يقدر على نَقله ولا

به پوختی واته: ((ئەگەر کەسێك بیەوێ کتێبەکانی بژمێرێت ناتوانێـت، چونکە ئەو بەردەوام دەنوسێت، وخوای تەعالاش منەتی بەسەردا کردوە کـە زۆر خێرا دەنوسێت وشت لەبەر دەنوسێت بەبێ نەقڵکردن)).

## قوتابیەکانی ئیبن تەیمیە

سەبارەت بە قوتابیەکانیشی، وەکو ئیبن حەجـەری عەسـقەلانی رَحِمَهُ ٱللَّهُ ئەفەرموێ: ((بەس بێت بۆ ئیبن تەیمیە کە ئیبن قەییم رَحِمَهُ ٱللَّهُ قوتابیەتی))[1].

ژمارەشیان زۆر زۆرە، ئەگەر تەنها باسی ناودار وکەڵەپیاوەکان بکـەین، بریتین لە:

١. زەهەبی: ((محمد بن أحمد بن عثمان الذهبي الشافعي)).

٢. ئیبن قەییمی جەوزی: ((محمد بن أبي بكر بن أيوب الحنبلي)).

٣. ئیبن عەبدولهادی: ((محمد بن أحمد بن عبد الهادي)).

---

يرده إليه فيذهب. وكان كثيرًا ما يقول قد كتبت في كذا وفي كذا. ويسئل عن الشَّيء فيقُول قد كتبت في هذا فلا يدري أين هو فيلتفت إِلَى اصحابه وَيَقُول ردوا خطي وأظهروه لينقل فَمن حرصهم عليه لا يردونه ومن عجزهم لا ينقلونه فيذهب ولا يعرف اسمه. فلهذه الْأَسْبَاب وغبرها تعذر إحصاء مَا كتبه وَمَا صنفه.

وَمَا كفى هَذَا إِلَّا أَنه لما حبس تفرق أَتْبَاعه وَتَفَرَّقَتْ كتبه وخوفوا أَصْحَابه من أَن يظهروا كتبه ذهب كل أحد بِمَا عِنْده وأخفاه وَلم يظهروا كتبه فَبَقِيَ هَذَا يهرب بِمَا عِنْده وَهَذَا يَبِيعهُ أَو يهبهُ وَهَذَا يخفيه ويودعه حَتَّى إِن مِنْهُم من تسرق كتبه أَو تجحد.

فَلَا يَسْتَطِيع أَن يطْلبهَا وَلَا يقدر على تَخْلِيصهَا فبدون هَذَا تتمزق الْكتب والتصانيف وَلَوْلَا أَن الله تَعَالَى لطف وأعان وَمن وأنعم وَجَرت الْعَادة فِي حفظ أَعْيَان كتبه وتصانيفه لما أمكن لأحد أَن يجمعها)).

(١) لەوەودوا دێت وئاماژەی پێدەکەین -بە ویستی خوا-.

٤. ئیبن کەسیر: «إسماعيل بن عمر بن كثير الشافعي».

٥. ئیبن موفلیح: «محمد بن مفلح بن محمد المقدسي الحنبلي».

٦. میززی: «يوسف بن عبد الرحمن بن يوسف المزي الشافعي».

٧. بەرزالی: «علم الدين القاسم بن محمد بن يوسف البرزالي».

٨. بەززارٍ: «عمر بن علي بن موسى البزار».

٩. ئیبن سەیید النـاس: «أبو الفتح محمد بن محمد بن محمد، ابن سيد الناس».

١٠. ئیبن ئەلموحیب ئەلصامت: «محمد بن عبد الله المقدسيّ».

١١. الواسطي: «أحمد بن ابراهيم بن عبد الرحمن الواسطي المعروف بابن شيخ الحزاميين». ئیبن تەیمیە پێی دەوت: جونەیدی زەمانی خۆی.

١٢. ئیبن الوردی: «عمر بن المظفر بن أبي الفوارس بن الوردي».

وهتد، کە ئەمانە دیار وناسراوەکانن وکتێبەکانیان بەناوبانگە لە هەمو بوارەکانی شەریعەت بە مێژو وتەفسیر وفیقھ وحەدیس وهتد لە هەمو دونیا.

جا باسکردنی ئیبن تەیمیە باسکردنی پیاوێکە کە ژیانی بـریتی بـوە لـە زانست وبانگەوازکردن وجیھاد وتێکۆشان بە دەست وزمان.

بۆیە ئـەڵێم: هەرکـەس ئـیبن تەیمیـە بناسـێت وکتابـەکانی بخوێنێتـەوە وزاناکانی دوای ئەویش بناسێت وکتێبەکانیان بخوێنێتەوە، بۆی ڕون دەبێتەوە ئەوە بۆ ٧٠٠ ساڵ بەڵکو زیاتریشە کەڵەپیاوی وا نەهاتوە وهاوشێوەی نەبوە، ئەمەش بە شاهێدی نەیارەکانی وەك باسدەکرێت، والله أعلم.

# هەمو كۆكن لەسەر ستايشكردنی بە نەيارەكانيشەوە

كە سەرنجی ژياننامەی دەدەيت دەبينی سەرجەم زاناكانی هەمو مەزهەبەكان كۆكن لەسەر ستايشكردنی، بە ڕادەيەك كە وتت شەيخ ئەلئيسلام «مامۆستای ئيسلام»[1] بريتيه لە ئيبن تەيميه، لە كاتێكدا دەيان كەس ئەم نازناوەيان هەبوە. وهەمو گەورە زاناكانی هەمو مەزهەبەكانی ئەو سەردەمە لە هەمو شارەكانەوە سوربون لەسەر حەديس لێبيستنی تەنانەت بە سۆفيەكانيشەوە[2]، ودەبينی ڕۆژی مردنەكەی چۆن هەزارەها خەڵك دەردەچن وبازاڕ پەكی دەكەوێ ودوكانەكان دادەخرێ وخەڵك دەردەچن بۆ شوێنەكەوتنی جەنازەكەی بە دۆست ودوژمنيەوە تەنها چەند كەسێك نەبێت لە ترسی خەڵك دەرناچن، تەنانەت ئيبن حەجەر ئاماژەيەك دەكات كە لەوەی ئيمامی ئەحمەد زياتر بوە ئەگەر بەراورد بكرێ -وەك باسی دەكەين-.

**ئيبن حەجەری عەسقەلانی شافعی** پەسەندنامەيەك بۆ كتێبی: «**الرد الوافر على من زعم أن من سمى ابن تيمية شيخ الإسلام كافر**» بە كوردی ناونيشانی كتێبەكە واتە: «وەڵامێكی تێروتەسەل بۆ ئەو كەسەی پێی وايە

---

(١) مەبەست هەقيقەتی نازناوەكە نيە، ئەو مامۆستای ڕەهابێت وئيسلام بۆ لای ئەو بگەڕێتەوە، ئەم قسە بەم مانا بێت ڕاست نيە، بەڵكو مەبەست پێی: ئيسلامی تازە كردۆتەوە وئاسەواری چاكی بەجێهێشتوە لە بەرگری لێكردنی، ئەم مانايەش دروستە. بڕوانە: القول المفيد (٢/٢٥١).

(٢) **هكذا تحدث ابن تيمية**، ل٨.

هەرکەس بڵێ ئیبن تەیمیە شێخی ئیسلامە کافرە»»، دەنوسێت ئەمە پوختەکەیەتی[1]: «ناوبانگی ئیمامێتی شێخ تەقیدین [واتە ئیبن تەیمیە] لە

---

(١) «الرد الوافر» (ص٥٩). عەرەبییەکەی: «الحمد لله وسلام على عباده الذين اصطفى، وقفت على هذا التأليف النافع والمجموع الذي هو للمقاصد التي جمع لأجلها جامع، فتحققت سعة اطلاع الإمام الذي صنفه، وتضلعه من العلوم النافعة بما عظّمه بين العلماء وشرّفه، وشهرة إمامة الشيخ تقي الدين أشهر من الشمس، وتلقيبه بشيخ الإسلام في عصره باق إلى الآن على الألسنة الزكية، ويستمر غدًا كما كان بالأمس، ولا ينكر ذلك إلا من جهل مقداره أو تجنب الإنصاف، مما أكثر غلط من تعاطى ذلك وأكثر عثاره، فالله تعالى هو المسؤول أن يقينا شرور أنفسنا وحصائد ألسنتنا بمنّه وفضله. ولو لم يكن من الدليل على إمامة هذا الرجل الا ما نبّه عليه الحافظ الشهير علم الدين البرزالي في تاريخه أنه لم يوجد في الاسلام من اجتمع في جنازته لمّا مات ما اجتمع في جنازة الشيخ تقي الدين، وأشار الى أن جنازة الإمام أحمد كانت حافلة جدا، شهدها ما بين مئي ألوف، ولكن لو كان بدمشق من الخلائق نظير من كان ببغداد بل أضعاف ذلك لما تأخر أحد منهم عن شهود جنازته.

وأيضًا فجميع من كان ببغداد إلا الأقل كانوا يعتقدون إمامة الإمام أحمد وكان أمير بغداد وخليفة الوقت إذ ذاك في غاية المحبة له والتعظيم، بخلاف ابن تيمية، فكان أمير البلد حين مات غائبا، وكان أكثر من في البلد من الفقهاء. فتعصبوا عليه حين مات محبوسا بالقلعة، ومع هذا فلم يتخلف منهم عن حضور جنازته والترحم عليه والتأسف عليه الا ثلاثة أنفس تأخروا خشية على أنفسهم من العامة. ومع حضور هذا الجمع العظيم فلم يكن لذلك باعث إلا اعتقاد إمامته وبركته لا بجمع سلطان ولا غيره. وقد صح عن النبي أنه قال أنتم شهود الله في الأرض. ولقد قام على الشيخ تقي الدين جماعة من العلماء مرارا بسبب أشياء أنكروها عليه من الأصول والفروع وعقدت له بسبب ذلك عدة مجالس بالقاهرة ودمشق. ولا يحفظ عن أحد منهم أنه أفتى بزندقته ولا حكم بسفك دمه مع شدة المتعصبين عليه حينئذ من أهل الدولة، حتى حُبس بالقاهرة ثم بالاسكندرية، ومع ذلك فكلهم معترف بسعة علمه وكثرة ورعه وزهده، ووصفه بالسخاء والشجاعة وغير ذلك من قيامه في نصر الاسلام والدعاء الى الله تعالى في السر والعلانية. فكيف لا ينكر على من أطلق أنه كان كافرا بل من أطلق على من سماه شيخ الاسلام الكفر. وليس في تسميته بذلك ما يقتضي ذلك، فإنه شيخ الاسلام

خۆر بڵاوتره، وناولێنانی به شیخ الإسلام لەسەردەمی خۆیەوە تا ئێستا مـاوە لەسەر زوبانە پاکـەکان، ولـە داهـاتوش دەمێنێتـەوە وەك چـۆن لـە پێشـتر ماوەتەوە، وکەس نکوڵی لەمە ناکـات مەگـەر نـەزان بـە قـەدری یـان بـێ ئینصاف، وسەرباری بونی ڕاجیاوازی هەندێك لـە زاناکـانی ئـەو سـەردەمە لەگەڵیدا، بەڵام کەسیان نەیوتوە زندیقە یـان خـوێنی حەڵاڵـە سـەرباری زۆر دەمارگیری نەیارەکانی، کەچی هەمویان دان دەنێن بە فراوانی زانسـتی وزۆر

---

بلا ريب. والمسائل التي أنكرت عليه ما كان يقولها بالتشهي ولا يصر على القول بها بعد قيام الدليل عليه عنادا. وهذه تصانيفه طافحة بالرد على من يقول بالتجسيم والتبري منه، ومع ذلك فهو بشر يخطىء ويصيب فالذي أصاب فيه - وهو الأكثر - يستفاد منه ويترحم عليه بسببه، والذي أخطأ فيه -بل هو معذور-، لأن أئمة عصره شهدوا له بأن أدوات الاجتهاد اجتمعت فيه، حتى كان أشد المتشغبين عليه القائمين في إيصال الشر اليه وهو كمال الدين الزملكاني يشهد له بذلك، وكذلك الشيخ صدر الدين ابن الوكيل الذي لم يثبت لمناظرته غيره. ومن أعجب العجب أن هذا الرجل كان أعظم قياما على أهل البدع من الروافض والحلولية والاتحادية، وتصانيفه في ذلك كثيرة شهيرة، وفتاويه فيهم لا يدخل تحت الحصر فيا قرة أعينهم إذا سمعوا تكفيره، ويا سرورهم إذا رأوا من يكفره من أهل العلم. فالواجب على من تلبس بالعلم وكان له عقل أن يتأمل كلام الرجل من تصانيفه المشهورة أو من ألسنة من يوثق به من أهل النقل فيفرد من ذلك ما ينكر فيحذر منه على قصد النصح، ويثني عليه بفضائله فيما أصاب من ذلك كدأب غيره من العلماء. ولو لم يكن للشيخ تقي الدين من المناقب الا تلميذه الشهير الشيخ شمس الدين ابن قيم الجوزية صاحب التصانيف النافعة السائرة التي انتفع بها الموافق والمخالف لكان غاية في الدلالة على عظيم منزلته. فكيف وقد شهد له بالتقدم في العلوم والتميز في المنطوق والمفهوم أئمة عصره من الشافعية وغيرهم، فضلًا عن الحنابلة.

فالذي يطلق عليه -مع هذه الأشياء- الكفر أو على من سماه شيخ الاسلام: لا يلتفت إليه ولا يعول في هذا المقام عليه، بل يجب ردعه عن ذلك الى أن يراجع الحق ويذعن للصواب. والله يقول الحق وهو يهدي السبيل وحسبنا الله ونعم الوكيل».

دوربونی له حەرام ودونیا نەویستی، وسەخاوەت وزیرەکی، وجگـە لەمانـەش له هەستان بە سەرخستنی ئیسـلام وبانگـەوازکردن بـۆلای خـوا بـە نهـێنی وئاشکرا، بۆیە بێگومان ئەو شێخی ئیسلامە، ئەو شتانەشی نکوڵی لە ئـیبن تەیمیە دەکرا، ئەوە نەبێت بە هەوەس وتبێتی، وسوریش نەدەبو لەسـەری بـە کەلەڕەقیەوە ئەگەر بەڵگـەی بـۆ ڕون ببوایەتـەوە، ئـەوەش نوسـراوەکانیەتی پڕیەتی لە بەر پەرچدانەوەی ئەوانەی بڕوایان بە تەجسیم هەیە وخۆی لێبـەری دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا مرۆڤـە وهەڵـە دەکـات ودەشـپێکێت، .. ونـەیارە گەورە سەرسەختەکانی سەردەمی خۆی کە هەوڵی زۆریان داوە توشی شـەڕی بکەن وزیانی پێبگەیەنن، شایەتی ئـەوەی بـۆ دەدن کـە ئـەهلی ئیجتهـادە، لەوانە: الزملكاني وئیبن الوكیـل، **جـا پێویسـتە لەسـەر ئەوانـەی بـەرگی زانستیان پۆشیوە وعەقڵیان هەیە لـە وتـەکانی ئـەم پیـاوە تێـڕا بمێـنن ئەویش لە ڕێی کتێبەکانیەوە یان لـە زمـانی ئەوانـەی جێـی متمانـەن،** ..بەس بێت بۆ ئیبن تەیمیە کە ئیبن قـەییم قوتابیـەتی، ئەمـە جگـە لـەوەی پێشـەوایانی سـەردەمی خـۆی لـە شـافعیەکان شـایەتی زۆر شـارەزایی ودەرکەوتنی بۆ دەدەن لە هەمو زانستەکاندا، ئەمە جگە لە حەنبەلیەکان».

**ستایشەکەی «ئیبن الزملكانی»ش**[1] کـە ئـیبن حەجـەر باسـی دەکـات وئـەڵێت زۆر دژ ونـەیاری ئـیبن تەیمیـە بـوە ودریغـی نـەکردوە لـە زیـان

---

(١) هو محمد بن علي بن عبد الواحد الأنصاري الشافعي، شيخ الشافعية بالشام، وانتهت إليه رئاسة المذهب في التدريس والإفتاء والمناظرة.

پێگەیاندنی، وەك لە کتێبی «الرد الوافر» دا هاتوە[1]، ئەمەیە بە پوختی: «بەڵام نکوڵی نەدەکرد لە پێشەوایەتی وفەزڵ وچاکەی ئیبن تەیمیە، تەنانەت جارێکیان وتی: ئەگەر پرسیاری لێبکرێ لەسەر بابەتێك، بەرامبەرەکەی وا

---

(١) «الرد الوافر» (ص٥٨ - ٥٩)، عەرەبیەکەی: «وَمَعَ ذَلِك فكَانَ يعْتَرف بإمامته وَلَا يُنكر فَضله وَلَا بره، قَالَ مرّة عَن الشَّيْخ تَقِيّ الدّين: كَانَ إِذا سُئِلَ عَن فن من الْعلم ظن الرَّائِي وَالسَّامِع أنه لَا يعرف غير ذَلِك الْفَنّ، وَحكم أَن أحدًا لَا يعرف مثله... وسُئِلَ عَنه، فَقَالَ: لم ير .. وغالب ظَنّه أنه قَالَ: من خَمْسِمائَة سنة احفظ مِنْهُ.

وَقد روى واشتهر وَذكر وانتشر مَا كتبه.. على كتاب: «بَيَان الدَّلِيل على بطلَان التَّحْلِيل» وَهُوَ مَا نَصه: «من مصنفات (سيدنَا) وَشَيخنَا وقدوتنا: الشَّيْخ الإِمَام الْعَالم الْعَلامَة الأوحد البارع الْحَافِظ الزَّاهِد الْوَرع الْقدْوَة الْكَامِل الْعَارِف، تَقِيّ الدّين شيخ الْإِسْلَام سيد الْعلمَاء قدوة الْأَئِمَّة الْفُضَلَاء، نَاصِر السّنة قامع الْبِدْعَة، حجَّة الله على الْعباد راد أهل الزيغ والعناد، أوحد الْعلمَاء العاملين، آخر الْمُجْتَهدين: أَبي الْعَبَّاس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام بن عبد الله بن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحَرَّاني حفظ الله على الْمُسلمين طول حَيَاته وَأَعَاد عَلَيْهِم من بركاته إِنَّه على كل شَيْء قدير». وَكتب أَيْضًا بِخَطِّهِ على كتاب: «رفع الملام عَن الائمة الْأَعْلَام» مَا نَصه: «تأليف الشَّيْخ الإمام الْعَالم الْعَلامَة الأوحد الْحَافِظ الْمُجْتَهد الزَّاهِد العابد الْقدْوَة إِمَام الائمة قدوة الْأمة عَلامَة الْعلمَاء وَارِث الانبياء آخر الْمُجْتَهدين أوحد عُلَمَاء الدّين بركَة الاسلام حجَّة الاعلام برهَان الْمُتَكَلِّمين قامع المبتدعين مُحي السّنة وَمن عظمت بِهِ لله علينا الْمِنَّة وَقَامَت بِهِ على أعدائه الْحجَّة واستبانت ببركته وهديه المحجة تَقِيّ الدّين أَبُو الْعَبَّاس احْمَد بن عبد الْحَلِيم بن عبد السَّلَام بن تَيْمِية الْحَرَّانِي أَعلَى الله مناره وشيد بِهِ من الدّين أَرْكَانه. ثمَّ ذكر أبياتا مِنْهَا: هُوَ حجَّة لله باهرة * هُوَ بَيْننَا أعجوبة الدَّهْر. هُوَ آيَة فِي الْخلق ظَاهِرَة * أنوارها أربت على الْفجْر.

وَقَالَ -أَيْضا-: اجْتمعت فِيهِ شُرُوط الِاجْتِهَاد على وَجههَا وَله الْيَد الطُّولى فِي حسن التصنيف وجودة الْعبارَة وَالتَّرْتِيب والتقسيم والتبيين... وقال: وَكَانَ الْفُقَهَاء من سَائِر الطوائف إِذا جَلَسُوا مَعَه استفادوا فِي مذاهبهم مِنْهُ مَا لم يَكُونُوا عرفوه قبل ذَلِك، وَلَا يعرف أَنه نَاظر أحدا فَانْقَطع مَعَه وَلَا تكلم فِي علم من الْعُلُوم سَوَاء كَانَ من عُلُوم الشَّرْع أَو غَيرهَا إِلَّا فاق فِيهِ أَهله والمنسوبين اليه، وَكَانَت لَهُ الْيَد الطُّولى فِي حسن التصنيف وجودة الْعبارَة وَالتَّرْتِيب والتقسيم والتبيين. وقال: .. ملازم لأنواع الْخَيْر وَتَعْلِيم الْعلم، حسن الْعبارَة، قوي فِي دينه، صَحِيح الذِّهْن، قوي الْفَهم»». اهـ بتصرف.

گومان دەبات لـەو بابەتـە زیـاتر نازانێـت وکەسـیش ئەوەنـدەی ئـەوی لـێ نازانێت، جارێکیشان پرسیاری لێکرا لەبارەیەوە، وتـی: ئـەوە بـۆ پێنجسـەد ساڵیشە لەو زیرەکترم نەدیوە ونەبیستوە لە لەبەرکردندا، تەنانەت پێشـەکیەك ئەنوسێ بۆ کتێبی «بيان الدليل على بطلان التحليل»ی ئـیبن تەیمیـە، تێیـدا ئەفەرموێ: لە نوسراوەکانی گـەورە ومامۆسـتامان وپێشـەنگمان، شـێخی، پێشەوای، زانای زۆر شارەزای، تاقانەی، لێهاتوی، حافزی[1] لە حـەرام دوری، وپێشەنگی، عارفی، شێخی ئیسلام، گـەورەی زانایـان، وپێشـەنگی پێشـەوا بەرێزەکان، سەرخەری سوننەت ولەناوبەری بیدعەت، حوججەتی خوا بەسـەر بەندەکانی، وەڵامـدەرەوەی لادەر وسەرکەشـەکان، تاقانـەی زانـا چـاکەکان، باوکی عەبباس: أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام ابن عبد الله ابن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحَرَّاني، خـوا بـۆ موسـڵمانانی بهێڵێـت، ولـە بەرەکەتی موسڵمانان بەهرەمەند بکات.

هـەروەها پێشـەکیەك دەنوسـێت بـۆ کتـێبی: «رفع الملام عَن الائمة الأعلام» کۆمەڵێك ستایشی هاوشێوەی دەکات، ئـەم شیعرەشـی بـە بـاڵادا دەڵێ:

ئەو بەڵگەیەکی دیاری خوایە * ئەو لە نێوانمان عەجایبی زەمانەیە
ئەو ئایەتێکە لە نێو خەڵکدا دیارە * ڕوناکیەکەی زاڵە بەسەر سپێدە

هەروەها ئەفەرموێ: مەرجەکانی موجتەهیدی وەك خۆی تێدا کۆ بۆتەوە، ودەستێکی باڵای هەیـە لـە جـوانی نوسـین ورێکـی عیبـارەت ورێکخسـتن ودابەشبەندی وڕونکردنەوە.

---

(١) «حـافظ» نازناوێکـە لـە زانسـتی فـەرمودەدا، بریتیـە لـەو زانایانـەی شـارەزای حەدیسەکانە، بەڕادەیەك ئەوەی دەیزانێت لـەبارەی فـەرمودە وپیاوەکانیـەوە زیـاترە لـەوەی نایزانێت.

هــەروەها ئەفــەرموێ: بــەهێزە لــە دینداریــدا، وزهنێکــی ڕاســت، وتێگەیشتنێکی بەهێزی هەیە)).

هەروەها **ئیبن دەقیقی عید** -کە ئەمیش موخـالفی ئـیبن تەیمیـە بـوە- ئەفــەرموێ: «**لما اجتمعت بابن تيمية رأيت رجلًا العُلوم كلها بين عَيْنَيْهِ يأْخُذ منها ما يريد ويدع ما يريد**»[1]. واتە: ((کە ئیبن تەیمیەم بـینی، تەماشـا دەکەم پیاوێکە زانستەکان هەموی ها لە پێش چاوی، کامــەی بوێـت باسـی دەکات وکامەشی نەوێت باسی ناکات)).

هەروەها **قازی سوبوکی شافعی**[2] -کە ئەمیش موخالفی ئـیبن تەیمیـە بوە- ئەفــەرموێ: «**والله يا فلان ما يبغض ابن تَيْمِية إِلَّا جاهل أو صَاحب هوى، فالجاهل لا يدري ما يقُول وصَاحب الهوى يصده هَوَاهُ عَن الحق بعد معرفته بِه**». واتە: ((واللە کەس ڕقی لە ئیبن تەیمیە نیە مەگەر نەزان یـان خاوەن ئارەزو وهەوەس، جا نەزان نازانێ چی ئەڵێ، وخاوەن هــەوا وئـارەزوش هەوەسەکانی ڕێگری لە هەق لێدەکەن دوای ناسینەوەی)).

هەروەها **زەهەبی** -کە هەندێك پێیـان وایـە ڕەخنــەی لـە ئـیبن تەیمیـە هەبوە!- ئــەڵێ: «**وَهُوَ أكبر من أن ينبه على سيرته مثلي، فلو حلفت بين الركن والمقام، لحلفت: إني ما رأيت بعيني مثله، وأنه مَا رأى مثل نفسه**».

---

(١) «الرد الوافر» (ص٥٩).

(٢) علي بن عبد الكافي بن علي السبكي الأنصاري الخزرجي، یەکێکـە لـە حـافزە موفەسیرەکان، وباوکی التاج ((السبكی))ە خاوەن «الطبقات»)، لە شـام قـازی بـوە، وچـەندین وەڵامی ئیبن تەیمیەی هەیە.

واتە: ((ئەو لەوە گەورەترە یەکێکی وەك من باسی ژیاننامــەی بکــات، ووالله ئەگەر بمەوێ سوێند بخۆم لە نێوان ڕوکــن ومەقامــدا لــە مەککــەدا، ســوێند دەخۆم، کە: وەکو ئەوم نەبینیوە، وخۆیشی وەك خۆی نەبینیوە))[1].

تەنانەت ئیبن تەرخانی مەلکاوی لە بارەی دوژمنــەکانی ئــیبن تەیمیــەوە ئەڵێ[2]: ((ئەگەر ئەوانیش بیانزانیایە ئەم چی ئــەڵێ وقســەکانی چــین، ئــەوا خۆشویان دەویست)).

هەر لەوانەی تر ستایشی دەکەن:

## ســتایشــی عــەلی وەردی بۆ ئیبن تــەیمیــە

عەلی وەردی کە نوسەرێکی دیاری شیعەی عێراقیە، لە بەراوردی نێــوان ئیبن تیمیە وغەزالیدا ئەڵێ:

«وهو في نظري، يلي الغزالي من حيث قوة الإبداع الفكري، لا سيما فيما يتصل بالناحية المنطقية. ولكن ابن تيمية يختلف عن الغزالي في ناحية أخرى. فقد رأينا الغزالي في أواخر أيامه ييأس من الناس ويعتزل الحياة.. أمـا ابـن تيميـة فقـد ظـل مشـاركا للنـاس فـي حيـاتهم يكـافح فيهـا كفـاح المستميت حتـى وصـل بـه الحـال مـرة أن لـبس لامـة القتـال واشـترك مـع الجيوش العربية في محاربة المغول قرب دمشق عـام ٧٠٢، وكـان إيمانـه وحماسته في المعركة من عوامل النصر على المغول. ولـم يسلم ابن تيمية

---

(١) «ذيل طبقات الحنابلة» (٤/٤٩٦).

(٢) «الرد الوافر» (ص١٤١).

من الاضطهاد والسجن لجرأته وصراحته في الإعلان عن رأيه. وقد انتهى الأمر به أخيرا أن مات في السجن»[1].

واته: «له دیدگای منەوە؛ ئەو لە فەلسەفە لە دوای غەزالیەوە دێت لە ڕوی بەهێزی داهێنانی فیکریەوە، بەتایبەتتر لەو لایەنەی پەیوەستە بە مەنتقەوە، بەڵام ئیبن تەیمیە لە غەزالی جیاوازترە لە ڕویەکی ترەوە، ئەوەتا غەزالیمان بینی، لە کۆتا ڕۆژکانی تەمەنیدا، لە خەڵك بێ ئومێد ئەبێ ولە ژیان دوردەگرێت، دورەپەرێز ئەبێ لە خەڵك ولە ژیان دور ئەکەوێتەوە، بەڵام ئیبن تیمیە هەر مایەوە لەناو خەڵك، لەو پێناوەدا کۆڵنەدەرانە وبە بەردەوامی تێدەکۆشا وزەحمەتی دەخوارد، تا کار گەیشتە ئەوەی جارێکیان قەڵغانی جەنگی بەست ولەگەڵ سوپا عەرەبیەکیاندا دژی مەغۆلەکان لە ساڵی ٧٠٢ لە نزیك دیمەشق بەشداری جەنگی کرد، وئیمان وحەماسەتی ئەو پیاوە لە جەنگەکەدا لە هۆکارەکانی سەرکەوتنیان بو بەسەر مەغۆلەکاندا. وکۆڵی نەدا لەژێر ئەو چەوساندنەوە وخستنە زیندانەدا کە ڕاشکاو وچاونەترس بو لە دەربڕینی ڕای خۆی، تا کار گەیشتە ئەوەی لە زیندان بمرێت».

هەروەها ئەڵێ: «وصل نقد المنطق على يد ابن تيمية إلى القمة»[2]. واته: «نەقد وڕەخنەگرتن لە مەنتق لەسەر دەستی ئیبن تەیمیە گەیشتە

(١) «منطق ابن خلدون» (ص٥٧).
(٢) «منطق ابن خلدون» (ص٥٧).

لوتكه)). ئەوه بريتيــه لــه عــەلى وەردى شـيعى لەمــەڕ عــەقڵ وبيروهــۆش وفەلسەفەی ئيبن تيميه ئاوها ئەڵێ.

## ستايشى عەلى نەششار بۆ ئيبن تەيميه

عەلى سامى ئەلنەششار «النشار» كه يەكێكه له نەيارانى ئيبن تيميــه، ئەڵێ: «كتاب ابن تيمية «نصيحة أهل الإيمان في الرد على منطق اليونان» يعاون الباحثين في تاريخ الحضارة الإسلامية على الكشف عن العبقرية الاسلامية في أرفع مظاهرها العقلية»[1].

واته: ((كتێبەكەی ئيبن تەيميه «نصيحة أهل الإيمان في الرد على منطق اليونان» ئەو كتێبه يارمەتی لێكۆڵەوەرانی مێژوی شارســتانيەتی ئيســلامی دەدات بــۆ دۆزينــەوەی عەبقەريــەتی ئيســلامی لــه بــەرزترين ديــاردەی عەقڵيدا)).

هــەروەها ئــەڵێ: «ترك ابن تيمية بما كتبه عن المنطق تراثًا علميًّا لا يقدر، وقام بمحاولة لا تجد لها شبيها في تاريخ العصور الوسطى».

واته: ((ئيبن تيميه بەوەی كه نوسيويەتی لەبارەی مەنتيقەوە توراســێكی زانستی وای بەجێهێشــتوه ناخەڵمێنــدرێ، هــەوڵێكی وای داوه، لــه مێــژوی سەدەكانی ناوەڕاستدا لەوێنەی نيه)).

قسەی تر وەی كەسی تر له نەيارانی زۆر زۆر زياترن.

---

(١) مقدمة «صون المنطق».

# ئیبن تەیمیە کەسێکی لێکۆڵەر وهەقویست بوە

ئــەم پیــاوە عــەودالّی هــەق بــوە وهەقویســت بــوە، تەنانــەت ئــەڵێ: بــەس بیسەلمێنن من هەڵەم، بەڵێن بێت پەشیمان ببمەوە! وەك ئەفــەرموێ: «مَعَ أَنِّي فِي عُمْرِي إِلَى سَاعَتِي هَذِهِ لَمْ أَدْعُ أَحَدًا قَطُّ فِي أُصُولِ الدِّينِ إِلَى مَذْهَبٍ حَنْبَلِيٍّ وَغَيْرِ حَنْبَلِيٍّ، وَلَا انْتَصَرْت لِذَلِكَ، وَلَا أَذْكُرُهُ فِي كَلَامِي، وَلَا أَذْكُرُ إِلَّا مَا اتَّفَقَ عَلَيْهِ سَلَفُ الْأُمَّةِ وَأَئِمَّتُهَا. وَقَدْ قُلْت لَهُمْ غَيْرَ مَرَّةٍ: أَنَا أُمْهِلُ مَنْ يُخَالِفُنِي ثَلَاثَ سِنِينَ إنْ جَاءَ بِحَرْفٍ وَاحِدٍ عَنْ أَحَدٍ مِنْ أَئِمَّةِ الْقُرُونِ الثَّلَاثَةِ يُخَالِفُ مَا قُلْته فَأَنَا أُقِرُّ بِذَلِكَ»[1]. واتە: «من لە تەمەنمدا هەتا ئەم ســاتەش لە عەقیدەدا کەسم بانگ نەکردوە بــۆ مەزهــەبی حەنبــەلی، وتــەنها باســی شتێك دەکەم هەمو سەلەف لەسەری کۆك بوبێتن، وزیاتر لە جارێك پێم وتون: من سێ ساڵ ئەدەمە هەمو ئەوانەی نەیاری منن، سێ ســاڵ بــۆ ئێــوە بــەس بیسەلمێنن من هەڵەم ویەك ڕستەم بۆ بهێنن لە سەردەمە زێڕینەکەوە، بــەڵێن بێت پەشیمان ببمەوە».

هەروەها ئەڵێ: «إن المجيب ولله الحمد لم يقل قط في مسألة إلا بقول قد سبقه إليه العلماء، فإن كان قد يخطر له ويتوجّه له فلا يقوله وينصره إلا إذا عرف أنه قد قال بعض العلماء، كما قال الإمام أحمد: «إياك أن تتكلم في مسألة ليس لك فيها إمام» فمن كان يسلك هذا المسلك كيف يقول قولا يخرق به إجماع المسلمين، وهو لا يقول إلا ما سبقه إليه علماء

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٢٨ – ٢٢٩).

المسلمين؟»[١]. واته: «الحمد لله هەرگیز شتێکم نەوتوە مەگەر پێش خۆم خەڵکێك لە زانایان باسیان کردوە».

## درۆکردن بە ناوی ئیبن تەیمیەوە

حافز بەززار رَحِمَهُ ٱللَّهُ ئەفەرموێ: «وَلم يزل المبتدعون أهل الاهواء، وآكلو الدُّنْيَا بِالدّينِ متعاضدين متناصرين فِي عدوانه، باذلين وسعهم بالسعي فِي الفتك بِهِ، متخرصين عَلَيْهِ بِالْكَذِبِ الصراح، مختلقين عَلَيْهِ وناسبين إليه مَا لم يقلهُ وَلم يَنْقُلهُ وَلم يُوجد لَهُ بِهِ خطّ وَلَا وجد لَهُ فِي تصنيف وَلَا فَتْوَى وَلَا سمع مِنْهُ فِي مجْلِس»[٢]. واته: «بەردەوام بیدعەچیەکان؛ شوێنکەوتوانی ئارەزو وهەوا، ودین بە دونیا فرۆشەکان هەمیشە دەست تیکەڵ وپشتیوانی یەکترن لە دژایەتیکردنی ئیبن تەیمیە، وزەفەر پێبردنی، ودرۆی ئاشکرا وڕونی بە دەمیەوە هەڵدەواسن، شتی وای

---

(١) «الإخنائية أو الرد على الإخنائي قاضي المالكية» (ص ٢٠٦).

ويقول ايضًا: «فَإِنَّ الْمَقْصُودَ أَنَّ الْحَقَّ دَائِمًا مَعَ سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَآثَارِهِ الصَّحِيحَةِ، وَإِنْ كَانَ كُلُّ طَائِفَةٍ تُضَافُ إِلَى غَيْرِهِ إِذَا انْفَرَدَتْ بِقَوْلٍ عَنْ سَائِرِ الْأُمَّةِ، لَمْ يَكُنِ الْقَوْلُ الَّذِي انْفَرَدُوا بِهِ إِلَّا خَطَأً، بِخِلَافِ الْمُضَافِيْنِ إِلَيْهِ أَهْلُ السُّنَّةِ وَالْحَدِيثِ؛ فَإِنَّ الصَّوَابَ مَعَهُمْ دَائِمًا، وَمَنْ وَافَقَهُمْ كَانَ الصَّوَابُ مَعَهُ دَائِمًا لِمُوَافَقَتِهِ إِيَّاهُمْ، وَمَنْ خَالَفَهُمْ فَإِنَّ الصَّوَابَ مَعَهُمْ دُونَهُ فِي جَمِيعِ أُمُورِ الدِّينِ، فَإِنَّ الْحَقَّ مَعَ الرَّسُولِ، فَمَنْ كَانَ أَعْلَمَ بِسَنَتِهِ وَأَتْبَعَ لَهَا كَانَ الصَّوَابُ مَعَهُ. وَهَؤُلَاءِ هُمُ الَّذِينَ لَا يَنْتَصِرُونَ إِلَّا لِقَوْلِهِ، وَلَا يُضَافُونَ إِلَّا إِلَيْهِ، وَهُمْ أَعْلَمُ النَّاسِ بِسُنَّتِهِ وَأَتْبَعُ لَهَا، وَأَكْثَرُ سَلَفِ الْأُمَّةِ كَذَلِكَ، لَكِنَّ التَّفَرُّقَ وَالِاخْتِلَافَ كَثِيرٌ فِي الْمُتَأَخِّرِينَ، وَالَّذِينَ رَفَعَ اللَّهُ قَدْرَهُمْ فِي الْأُمَّةِ هُوَ بِمَا أَحْيَوْهُ مِنْ سُنَّتِهِ وَنُصْرَتِهِ» «منهاج السنة» (١٨٢/٥).

(٢) الأعلام العلية، ل٧٣.

دەدەنــە پــاڵ ودرۆی وا ئەکــەن بــە دەمیــەوە لــە زاری نەهاتۆتــە دەر ولــە کەسیشەوە نەقڵی نەکردوە، وکەسیش بە دەستوخەتی ئەو نەیبینیوە، نــە لــە کتێبێکی ئەودا بینراوە نە لە فەتوایەکی، ونــە لــە هــیچ دانیشــتنێکدا لیێــی بیستراوە )).

کەواتە درۆکردن بەناوی ئیبن تیمیەوە مێژوەکەی دور ودرێژە، ئیبن تیمیە هەبوە وبانگەوازی هەبوە، درۆش بەناویەوە هەبوە تا زیادی کردبێــت زیــادی کردوە.

بۆیە هەر لە ژیانی خۆیدا هەســتی بەمــە کــردوە وزۆری بــە دەســتیەوە چەشتوە. وەك لە دانیشتنی موناقەشەی عەقیــدەی واســتیەدا ئــەڵێ: «.. ثُم قُلْت لِلْأَمِيرِ وَالْحَاضِرِينَ: أَنَا أَعْلَمُ أَنَّ أَقْوَامًا يَكْذِبُونَ عَلَيَّ؛ كَمَا قَدْ كَذَبُوا عَلَيَّ غَيْرَ مَرَّةٍ، وَإِنْ أَمْلَيْت الِاعْتِقَادَ مِنْ حِفْظِي؛ رُبَّمَا يَقُولُونَ كَتَمَ بَعْضَهُ، أَوْ دَاهَنَ وَدَارَى، فَأَنَا أُحْضِرُ عَقِيدَةً مَكْتُوبَةً مِنْ نَحْوِ سَبْعِ سِنِينَ قَبْلَ مَجِيءِ التتر إلَى الشَّامِ، وَقُلْت قَبْلَ حُضُورِهَا كَلَامًا قَدْ بَعُدَ عَهْدِي بِهِ، وَغَضِبْت غَضَبًا شَدِيدًا، لَكِنِّي أَذْكُرُ أَنِّي قُلْت: أَنَا أَعْلَمُ أَنَّ أَقْوَامًا كَذَبُوا عَلَيَّ، وَقَالُوا لِلسُّلْطَانِ أَشْيَاءَ، وَتَكَلَّمْت بِكَلَامِ احْتَجْت إلَيْهِ، مِثْلَ أَنْ قُلْت: مَنْ قَامَ بِالْإِسْلَامِ أَوْقَاتَ الْحَاجَةِ غَيْرِي؟! وَمَنْ الَّذِي أَوْضَحَ دَلَائِلَهُ وَبَيَّنَهُ؟! وَجَاهَدَ أَعْدَاءَهُ وَأَقَامَهُ لَمَّا مَالَ حِينَ تَخَلَّى عَنْهُ كُلُّ أَحَدٍ!؟ وَلَا أَحَدٌ يَنْطِقُ بِحُجَّتِهِ وَلَا أَحَدٌ يُجَاهِدُ عَنْهُ! وَقُمْت مُظْهِرًا لِحُجَّتِهِ مُجَاهِدًا عَنْهُ مُرَغِّبًا فِيهِ؟! فَإِذَا كَانَ هَؤُلَاءِ يَطْمَعُونَ فِي

الْكَلَامِ فِيَّ، فَكَيْفَ يَصْنَعُونَ بِغَيْرِي؟! وَلَوْ أَنَّ يَهُودِيًّا طَلَبَ مِنْ السُّلْطَانِ الْإِنْصَافَ: لَوَجَبَ عَلَيْهِ أَنْ يُنْصِفَهُ..»[١].

واتە: «پاشان بە ئەمیر وئامادەبوانم وت: من ئەزانم خەڵكانێك درۆ دەكەن بەناوی منەوە، وەكو چۆن چەندین جاری تر درۆیان بەدەمی منەوە كردوە، وئەگەر لەبەر وبە «حفظ» بیروباوەڕەكە باسبكەم، لەوانەیە بڵێن: ئەوە هەندێكی باسناكات، یا موجامەلە دەكات، دەی ئەوە من بیروباوەڕێكی نوسراوی خۆمتان پێدەدەم هی حەوت ساڵ پێش ئێستایە؛ پێش ئەوەی تەتار بێت بۆ شام».

تەنانەت درۆ وبوهتان كردن بەناویەوە گەیشتۆتە ئەو ئاستەی دەسەڵاتداران چەندین جار ناردویانە بە دواییدا بۆ لێپێچەنەوە ولێپرسینەوە لەسەر ئەو دەنگۆیانەی هەیە لەسەری، هەربۆیە وتەیەك ئاراستەی هەندێك لە دەسەڵاتداران دەكات وباسی مەزڵومی خۆی دەكات كە تەنانەت بۆ جارێكیش گوێیان لێنەگرتوە لە كاتی حوكمدان بەسەریدا، وەك ئەفەرموێ: «فإنه في آخر شهر رمضان سنة ست وسبعمائة، جاء أميران رسولين من عند الملأ المجتمعين من الأمراء والقضاة ومن معهم، وذكرا رسالة من عند الأمراء، مضمونها طلب الحضور، ومخاطبة القضاة لتخرج وتنفصل القضية، وأن المطلوب خروجك، وأن يكون الكلام مختصرًا، ونحو ذلك. فقلت: سلم على الأمراء، وقيل لهم: لكم سنة، وقبل السنة مدة أخرى

(١) «مجموع الفتاوى» (٣/١٦٢-١٦٣).

تسمعون كلام الخصوم الليل والنهار، وإلى الساعة لم تسمعوا مني كلمة واحدة، وهذا عن أعظم الظلم، فلو كان الخصم يهوديًّا أو نصرانيًّا أو عدوًا آخر للإسلام ولدولتكم، لما جاز أن تحكموا عليه حتى تسمعوا كلامه، وأنتم قد سمعتم كلام الخصوم وحدهم في مجالس كثيرة، فاسمعوا كلامي وحدي في مجلس واحد، وبعد ذلك نجتمع ونتخاطب بحضوركم، فإن هذا من أقل العدل الذي أمر الله به في قوله: [إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا]. فطلب الرسولان أن أكتب ذلك في ورقة، فكتبته»[1].

باسی ئەوە کە دەسەڵات خەڵکی ناردوە بە دواییدا بۆ ئامادەبون لەبەردەم دادگا، ئەویش تویەتی: ناکرێت چەندین جار گوێتان لە بوهتان ودرۆی نەیارانم گرتوە کەچی جارێکیش گوێتان لە من نەگرتوە، ئەمەش لە ستەمترین ستەمەکانە، لە کاتێکدا ئەگەر تۆمەتبار جولەکە وگاوریش بێت ودژی دەوڵەتەکەتان بێت، نابێت بڕیاری لەسەر بدەن بە بێ گوێ لێگرتنیان، کەچی چەندین جار گوێتان لە نەیارەکانم گرتوە، بەڵام بۆ جارێکیش گوێتان لە من نەگرتوە.

جا لەبەر ئەوەی نەیارەکانی زۆرێکیان دەست ڕۆیشتو بون وپۆست وپلەیان لە میریدا هەبو، ئیبن تەیمیە دەخەنە زیندان.

(١) التسعينية، (١/١٠٩-١١٠).

كە دەردەچێت نامەیەك بۆ دۆست وقوتابییەكانی دەنوسێت وباسی وردەكاری ڕوداوەكانیان بۆ دەكات، چونكە ئەو ماوەیەی لە زیندان بوە قواستویانەتەوە بۆ درۆ وبوهتانكردن بەناویەوە، وەك ئەفەرموێ: «تَعْلَمُونَ كَثْرَةَ مَا وَقَعَ فِي هَذِهِ الْقَضِيَّةِ مِنْ الْأَكَاذِيبِ الْمُفْتَرَاةِ، وَالْأَغَالِيطِ الْمَظْنُونَةِ، وَالْأَهْوَاءِ الْفَاسِدَةِ، وَأَنَّ ذَلِكَ أَمْرٌ يُجَلُّ عَنْ الْوَصْفِ، وَكُلُّ مَا قِيلَ: مِنْ كَذِبٍ وَزُورٍ فَهُوَ فِي حَقِّنَا خَيْرٌ وَنِعْمَةٌ...

فَلَا أُحِبُّ أَنْ يُنْتَصَرَ مِنْ أَحَدٍ بِسَبَبِ كَذِبِهِ عَلَيَّ أَوْ ظُلْمِهِ وَعُدْوَانِهِ فَإِنِّي قَدْ أَحْلَلْت كُلَّ مُسْلِمٍ، وَأَنَا أُحِبُّ الْخَيْرَ لِكُلِّ الْمُسْلِمِينَ وَأُرِيدُ لِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ الْخَيْرِ مَا أُحِبُّهُ لِنَفْسِي.

وَالَّذِينَ كَذَبُوا وَظَلَمُوا فَهُمْ فِي حِلٍّ مِنْ جِهَتِي...

فَلَوْ كَانَ الرَّجُلُ مَشْكُورًا عَلَى سُوءِ عَمَلِهِ لَكُنْت أَشْكُرُ كُلَّ مَنْ كَانَ سَبَبًا فِي هَذِهِ الْقَضِيَّةِ لِمَا يَتَرَتَّبُ عَلَيْهِ مِنْ خَيْرِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، لَكِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَشْكُورُ عَلَى حُسْنِ نِعَمِهِ وَآلَائِهِ وَأَيَادِيهِ الَّتِي لَا يُقْضَى لِلْمُؤْمِنِ قَضَاءٌ إلَّا كَانَ خَيْرًا لَهُ، وَأَهْلُ الْقَصْدِ الصَّالِحِ يُشْكَرُونَ عَلَى قَصْدِهِمْ وَأَهْلُ الْعَمَلِ الصَّالِحِ يُشْكَرُونَ عَلَى عَمَلِهِمْ وَأَهْلُ السَّيِّئَاتِ نَسْأَلُ اللَّهَ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ. وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ هَذَا مِنْ خُلُقِي. وَالْأَمْرُ أَزْيَدُ مِمَّا كَانَ وَأَوْكَدُ...»(١).

واتە: «ئێوە دەزانن ئەم كێشە چەند درۆ وناڕاستی وقسەی بێسەروبەر وبەدگومانی وهەوا وئارەزوی فاسدی تێكەڵ بو! كە لەوە گەورەترە وەسف بكرێن، وهەرچیشمان لەبارەوە وترابێت لە درۆ ودەلەسە ئەوە بۆ ئێمە چاكە

(١) «مجموع الفتاوى» (٢٨/٥٥-٥٧).

ونیعمەتە إن شاءالله، **جا پێم خۆش نیە تۆڵە لە کەس بکرێتەوە بەهۆی درۆکردنی بەدەمی منەوە یان ستەمکردنی ودەستدرێژی کردنی، چونکە من گەردنی هەمو موسڵمانێکم ئازاد کردوە، وحەزم لە خێرە بۆ سەرجەم موسڵمانان، وئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە لە خێر وخۆشی بۆ ئەوانیش پێم خۆشە.**

**وئەوانەشی ستەمیان کردەوە لەلایەن منەوە گەردنیان ئازاد بێت وتەنها هەقی خوای تەعالا دەمێنێتەوە...**

وئەگەر سوپاسی کەس بکرایە لەسەر کارە خراپەکانی ئەو سوپاسی هەمو ئەوانەم دەکرد بونەتە هۆی ئەم کێشە بەهۆی ئەو خێرە دونیایی وئاخیرەتیان لێیدەکەوێتەوە، ... ئەوانەشی تاونبارن داواکارم لە خوای گەورە لێیان ببورێت)).

بەڵکو کار گەیشتۆتە تەزویرکردنی نامەیەك بەناوی ئیبن تەیمیەوە، نامەکە ئەگاتە دەست جێگری سوڵتان، گوایە ئیبن تەیمیە لەگەڵ کۆمەڵێك لە دەوروبەرەکەی ناردویەتی بۆ تەتارەکان وداوای گۆڕینی جێگری سوڵتانی لێدەکەن لە شام، ئەویش کە تەماشای دەکات ولێی ورد دەبێتەوە بۆی دەردەکەوێت تەزویرە، کە لێکۆڵینەوەی لێدەکات دەردەکەوێت پیاوێکی ناسراو بە شەڕ وفزوڵی نوسیویەتی ومسودەی نامەکەشیان لەلا دۆزیەوە[1].

(١) «البداية والنهاية» (٢٢/١٤).

هەورەها لەو دانیشنەی عەقیـدە واسـتیەکە ئـەڵێ: «أَمَّا الِاعْتِقَادُ: فَلَا يُؤْخَذُ عَنِّي وَلَا عَمَّنْ هُوَ أَكْبَرُ مِنِّي؛ بَلْ يُؤْخَذُ عَنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَا أَجْمَعَ عَلَيْهِ سَلَفُ الْأُمَّةِ، فَمَا كَانَ فِي الْقُرْآنِ وَجَبَ اعْتِقَادُهُ، وَكَذَلِكَ مَا ثَبَتَ فِي الْأَحَادِيثِ الصَّحِيحَةِ مِثْلِ صَحِيحِ الْبُخَارِيِّ وَمُسْلِمٍ، وَأَمَّا الْكُتُبُ فَمَا كَتَبْت إلَى أَحَدٍ كِتَابًا ابْتِدَاءً أَدْعُوهُ بِهِ إلَى شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ، وَلَكِنِّي كَتَبْت أَجْوِبَةً أَجَبْت بِهَا مَنْ يَسْأَلُنِي مِنْ أَهْلِ الدِّيَارِ الْمِصْرِيَّةِ وَغَيْرِهِمْ.

وَكَانَ قَدْ بَلَغَنِي أَنَّهُ زُوِّرَ عَلَيَّ كِتَابٌ إلَى الْأَمِيرِ رُكْنِ الدِّينِ الجاشنكير أُسْتَاذِ دَارِ السُّلْطَانِ يَتَضَمَّنُ ذِكْرَ عَقِيدَةٍ مُحَرَّفَةٍ وَلَمْ أَعْلَمْ بِحَقِيقَتِهِ، لَكِنْ عَلِمْت أَنَّهُ مَكْذُوبٌ.

وَكَانَ يَرِدُ عَلَيَّ مَنْ مِصْرَ وَغَيْرِهَا مَنْ يَسْأَلُنِي عَنْ مَسَائِلَ فِي الِاعْتِقَادِ وَغَيْرِهِ فَأُجِيبُهُ بِالْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ وَمَا كَانَ عَلَيْهِ سَلَفُ الْأُمَّةِ»[1].

واتە: «.. بەڵێ پێم گەیشتوە کە نوسراوێك بەناوی منەوە تەزویر کـراوە ونێردراوە بۆ ئـەمیر ڕوکنـەدین جاشـنەگیر ئوسـتادی خانـەی سـوڵتان، کـە بیروباوەڕێکی دەستکاری کراوی تێدایە، وئاگاداری وردەکاریەکەی نیم، بـەڵام دەزانم درۆیە بە دەم منەوە..».

ئەگەرچی سبحان الله ئەم پیاوە ئەم هەمو کێشـەیە خـاوی نەکردۆتـەوە وڕای نەوەسـتاندوە وهـەقی بـە ئاشـکرا ڕونکردۆتـەوە وزانیویـەتی ڕۆژێـك عـاقڵەکان تەماشای بکەن تێدەگەن کە هەق لەگەڵ کێدایە.

(١) «مجموع الفتاوى» (٣/١٦١).

# وەڵامی درۆ وبوهتانەکان

سەبارەت بەو شتانەی دەدرا پاڵی، زۆرن، درێـژە نادەمـە باسـکردنیان ووەڵامدانەوەیان -بۆ کاتێکی تر بە ویستی خوای میهرەبان شی دەکەینەوە-، وتەیەکی ئیبن حەجەری شافیعی دەهێنینـەوە کـە ئەفـەرموێ: «والمسائل التي أنكرت عليه ما كان يقولها بالتشهي ولا يصر على القول بها بعد قيام الدليل عليه عنادا. وهذه تصانيفه طافحة بالرد على من يقول بالتجسيم والتبري منه، ومع ذلك فهو بشر يخطىء ويصيب فالذي أصاب فيه - وهو الأكثر - يستفاد منه ويترحم عليه بسببه»[1].

واتە: ((ئەو شتانەی نکوڵی لە ئیبن تەیمیە دەکرا لەسەری، ئەوە نەبێت بە هەوەس وتبـێتی، وبەڵگـەی بـۆ ڕون بوایەتـەوە سـور نـەدەبو لەسـەری بـە کەلەڕەقیەوە، ئـەوەش نوسـراوەکانیەتی پڕیـەتی لـە بەرچـدانەوەی ئەوانـەی بڕوایان بە تەجسیم هەیە، وخۆی لێبەری دەکات)).

هەروەها د. سەعید ڕەمەزان بوتی -غفر الله لە- ئـەڵێ: «ودفاعي عن ابن تيمية ضد الذين كفروه، فالذين كفروا ابن تيمية لم يكفروه لأنه لم يؤوّل آيات الصفات، وإنما لأنهم نسبوا إليه تهمة التجسيد وهذا ما لم أجد دليلاً عليه». واتە: ((... وبەرگری من لە ئیبن تەیمیە دژی ئەوانەیـە تـەکفیری

---

(١) «الرد الوافر» (ص٢٤٧).

دەکەن ... لەبەر ئەوەی تۆمەتی تەجسیم[1] دەدەنە پاڵی ولەسەر ئەمەش من هیچ بەڵگەیەکم دەست نەکەوتوە کە وابێت)).

هــەروەها ئــەڵێ: «ونحن نعجب عندما نجد غلاة يكفرون ابن تيمية رحمه الله ويقولون إنه كان مجسداً، ولقد بحثت طويلًا كي أجد الفكرة أو الكلمة التي كتبها أو قالها ابن تيمية والتي تدل على تجسيده فيما نقله السبكي أو غيره فلم أجد كلاماً في هذا قط، كل ما وجدته أنه في فتواه يقول: إن لله يد كما قال واستوى على العرش كما قال وله عين كما قال، ورأيت أناسا يكفرون الإمام أبا الحسن الأشعري لأنهم يقولون: إنه معطل، وإنه متأول، وبحث ورجعت إلى كتبه وإلى آخر ما كتب وهو كتاب «الإبانة» فرأيته يقول كما يقول ابن تيمية واقرؤوا كتاب الإمام أبي الحسن الأشعري «الإبانة» الذي يقول فيه نؤمن أن الله يداً كما قال وأنه استوى على العرش كما قال. إذن فلماذا نحاول أن نعظم وهماً لا وجود له؟ ولماذا نحاول أن ننفخ في نار شقاق؟ والله سبحانه وتعالى سيحاسبنا على ذلك»[2].

واتە: ((وزۆر سەیرم لێدێت کە کۆمــەڵێ تیــژڕەو دەبیــنم تــەکفیری ئــیبن تەیمیە دەکەن گوایە موجەسیمە بوە، منیش زۆر گەڕام بــۆ ئــەوەی فکرەیــەك یان ڕستەیەك کە هی ئەوە یا ئەو وتویەتی وبەڵگە بێت لەسەر تەجســیم وەك سوبوکی وجگە لەویش باسی دەکەن، بەڵام هەرگیز هیچم لەم بــارەوە دەســت

(١) تەجسیم، بە جسم ولاشە شوبهاندنی خوایە تبارك وتعالی
(٢) «ندوة اتجاهات الفكر الإسلامي المعاصر» (ص٢٦٤-٢٦٥).

نەکەوت ... ئیتر بۆ هەوڵ بدەین خەیاڵێك گەورە بکەینەوە کە ئەسڵی نیە...)).

## ئیبن تەیمیە وتەکفیرکردن

ئەمە پرسێکی گرنگە، چونکە زۆر وروژێندراوە ولە دژ ئەهلی سوننەت زۆر بەکارهێنراوە، گوایە: ئیبن تیمیە تەکفیریە وفەتواکانی ئەو تاکی تەکفیری دروست دەکات، وئەو مامۆستای تەکفیریەکانە وسەرچاوەکەیانە، وبە تەکفیریەکان دەوترێ: لە ئیبن تیمیە بۆیان ماوەتەوە!

بەڵام ئایا تا چەند ئیبن تیمیە وایە، هەڵوێستی چۆن بوە لەمەڕ ئەم پرسە، چ وەك حوکمدان وقسەکردنی لەسەر نەیارەکانی کە زۆر بون وزۆریان پێکردوە، چ وەکو تەتبیقی کرداری وهەڵسوکەوتی عەمەلی لەگەڵیاندا.

وا لە خوارەوە -بە ویستی خوا- بۆتان ڕون دەبێتەوە ئیبن تەیمیە وسەلەفیەکان زۆر دورن لە تەکفیر وتەکفیریەکانەوە.

**سەرەتاش پێش چونە ناو باسەکە، حەزدەکەم پێشەکیەك وهەندێ بنەما لە بارەی تەکفیرەوە بخەمە ڕو:**

١. تەکفیر لە هەمو دینێك، لە هەمو مەزهەبێك، لە هەمو فیکرەیەکدا بونی هەیە، هەر دینێك یا مەزهەبێك یا فکرەیەك پیادە کەرانی وەسف دەکات بە بڕوادار؛ بڕوادار بەو دین ومەزهەب وفکرەیە، وپیادە نەکەرانیشی بە بڕوادار بە بێبڕوا؛ بێبڕوا بەو دین ومەزهەب وفکرەیە، کەواتە ئەوەی سنورێکی فیکری هەبێ -هەر فیکرێك بێت- هەرکەس لەو سنورە

نەبێت وبڕواشی پێ نەبێت، بێشەك وگومان ئۆتوماتیکی ها لە دەرەوەی، ئەم لە دەرەوە بونە خۆی بۆخۆی تەکفیرە، بەڵام ئەوەندە هەیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، ولە ئاینێکەوە بۆ ئاینێکی تر، ولە فیکرەیەکەوە بۆ یەکێکی تر ناوەکەی ووردەکاریەکەی ئەگۆڕێت.

لای ئەهلی ئیسلام وزۆرێکی ئاینەکانی تر کوفری پێئەڵێن، ئەوی تریان شتێکی تری پێئەڵێ. کەواتە هەمو ئاینە ئاسمانیەکان وەکو ئیسلام وجولەکە وگاور وهتد، وجگە لەمانیش لە ئاین وئایدۆلۆجیا مرۆییەکان، ئەوەی بەس سنورێکی فیکری دیاریکراو وعەقیدەیەکی تایبەتی هەڵگرتبێت وەکو شوعیەت وعەلمانیەت وهتد هەمو ئەمانە ئەوەی لە بازنە وسنورەکەی خۆی بڕواتە دەرەوە تەکفیری ئەکەن بە ئوسلوب وشێواز ولەفزی تایبەت بە خۆیان.

تەنانەت لە بیری نەتەوایەتی وناسۆنالیزمدا تەکفیری تێدایە، بۆ مەگەر ئەو شتانەی کە لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن وبە تایبەت تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان وئەوەی پێی ئەوترێ سۆشیال میدیا دەبینرێ ودەبیسترێ، لە کۆمەڵێك بە ناو ڕۆشنفیکرەکان وجگە لەوانیش تەکفیر نیە؟! بەو دەوترێ: جاش، ئەوی تر: خۆفرۆش، ئەوی تر: نۆکەری بێگانە، ئەمە ڕێك هاوواتا «مرادف»ی وشەی: ((تەکفیر))ە، چونکە لە کوردبون دەیبەیتە دەرەوە، بە ڕەوای نابینی پێی بوترێ: کوردێکی ساغە، ئەمە خۆی بۆ خۆی جۆرێکە لە تەکفیر. ئیتر لەوەودواش باسی کوشتنی جاش وخۆرفرۆش ونۆکەرانی بێگانە دێتە پێشەوە.

یان ئەوەی ئەوترێ: فلاَن بڕوای بە دیموکراسیەت نیە، ئەمەش وەکو ئەوە وایە بە کەسێك بلێی: بڕوای بە ئیسلام نیە. بەلاَم چیە عیبارەتی: «بڕوای بە دیموکراسیەت نیە یا بڕوای ئیسلام نیە» هەندێك موسەققەفانە ونەرم ونیانانەیە. بەلاَم کافر بە دیموکراسی ڕەقترە.

٢. هەروەها تکفیر حوکمێکی شەرعیە نکوڵی لێناکرێ. کە حوکمی خوا وپەیامبەرەکەیەتی ﷺ، وهیچ گروپێك لە موسڵمانان نکوڵی لێنەکردوە، ئەوەی نکوڵی لێئەکەین زیادەڕۆیی وپەرگیری کردنە تێیدا؛ کەسێك کافر نەبێ، حوکمی کوفری بەسەردا بدا یا هەر بەزۆر بیکاتە کافر بە هەوەسی خۆی، ئەگەرنا ناوەندگیری ومیانڕەوی لەم بابەتەدا حوکمێکی شەرعیە.

٣. وڕەدکردنەوەی تەکفیریش بە ڕەهایی «مطلقًا»، بوترێ: فلاَن کەس یا فلاَن بۆچون وحیزب کەس تەکفیر ناکا، ئەمە مایەی شانازی نیە وخۆی لە خۆیدا ئەمە بریتیە لە دو شت:

- دژی واقیعە، چونکە لە واقعدا ئەبینین هەر هەموی تەکفیری هەیە بە جۆرێك وبە ناوێك وبە شێوازێك.

- هەروەها دژی مەنتفە، یانی: ئەمە دژی فکرەی بڕوابونە بە بۆچونێکی سنور دیاریکراوی چەسپاو. واتە: کە تۆ بڕوات بەفکرەیەکی دیاری کراو هەبو، بێشەك وگومان ئەوەی بڕوای بەو فکرە دیاریکراوە نەبێ لە دەرەوەیەتی، جا ئەو لەدەرەوە بونە خۆی بۆ خۆی تەکفیرە.

کەواتە هەرکەس بڵێ: بڕوام بە تەکفیر نیە، جگە لەوەی وا نیــە وڕاسـت ناکات، وەکو ئەوەش وایە بڵێ: تـۆ چـۆن بـیر دەکەیتـەوە وەکـو مـن بـیرت کردۆتەوە وبۆچونی تۆ بەدەر نیە لە بۆچونی من -ئەگەر دژیشی بێت-!!

٤. لـە هـەمو گروپێکـدا تـەکفیر هەیـە، بـەڵام سـەلەفیەت (ئـەهلی سـوننەت وجەماعــەت) لــە هــەمویان مامناوەنــدتر وبــە ڕەحمــتر وڕێکــتر ودادگەرترن لەم بارەوە **والحمد لله**. بۆ زیاتر بڕوانە خاڵی «٧».

٥. بەهەمان شێوە دورخستنەوەی نەیار ودژبیران لەلای هـەموان هەیـە بەڵام مامناوەندترینیان ئەهلی سوننەت وجەماعەتە.

٦. خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیــە: لای ئــەهلی ســوننەت وجەماعــەت، تەکفیر وکوشتن لازم ومەلزومی یەك نین، واتــە: لەســەر یــەك ڕانەوەسـتاون، یـانی: ئـەکرێ کەسـێك بکوژرێـت کـافریش نـەبێت وەك کوشـتنەوە لەبـەر کوشتنی کەسێك، یان چەك لە دژ دەوڵەت هەڵگرتن، هەروەها ئەشکرێ کافر بێت ونەشکوژرێ وەك پەیامبەر ﷺ هاوسێی جولەکەی هەبوە وبە درێـژایی مێـژو کـافران لـە وڵاتـی موسـڵمانان هـەبون ولـەناو نـەبراون، کـە هـەمو موسڵمانێك ئەمە دەزانێت، تەنانەت ئیبن تەیمیە ئەوترێ کتێبێکی هەیە بـەو ناونیشانەوە کە کافر لەبـەر کوفرەکـەی ناکوژرێـت، ولـە کتـێبی: «السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية» (ل٩٩-١٠٠) ئەفـەرموێ: «وَإِذَا كَانَ أَصْلُ الْقِتَالِ الْمَشْرُوعِ هُوَ الْجِهَادُ، وَمَقْصُودُهُ هُوَ أَنْ يَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ، وَأَنْ تَكون كلمة الله هي العليا، فمن امتنع من هَذَا قُوتِلَ بِاتِّفَاقِ الْمُسْلِمِينَ. وَأَمَّا

مَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْ أَهْلِ الْمُمَانَعَةِ وَالْمُقَاتَلَةِ، كَالنِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ وَالرَّاهِبِ، وَالشَّيْخِ الْكَبِيرِ، وَالْأَعْمَى، وَالزَّمِنِ، وَنَحْوِهِمْ فَلَا يُقْتَلُ عِنْدَ جُمْهُورِ الْعُلَمَاءِ؛ إِلَّا أَنْ يُقَاتِلَ بِقَوْلِهِ أَوْ فِعْلِهِ، وَإِنْ كَانَ بَعْضُهُمْ يَرَى إِبَاحَةَ قَتْلِ الْجَمِيعِ لِمُجَرَّدِ الْكُفْرِ؛ إِلَّا النِّسَاءَ وَالصِّبْيَانَ؛ لِكَوْنِهِمْ مَالًا لِلْمُسْلِمِينَ. وَالْأَوَّلُ هُوَ الصَّوَابُ؛ لِأَنَّ الْقِتَالَ هُوَ لِمَنْ يُقَاتِلُنَا». به کورتی واته: «بوچونی پەسەندی جمهور وزۆربەی زانایان ئەوەیە بێباوەڕ لەبەر شەڕکردنی لەگەڵماندا دەکوژرێت نەك لەبەر کوفرەکەی ئەمەش ڕای پەسەند وتەواوە».

٧. مەنهەجی ئەهلی وسوننەت وجەماعەت مەنهەجە وکەس وشەخص نیە، کە بریتیە لە ئیسلامە ڕەسەن وبێخەوشەکە، چۆن کاری موسڵمانان لەسەر ئیسلام حیساب نیە، ئاوهاش کاری تاکی سوننی لەسەر مەزهەب ومەنهەجەکە حسێب نیە، کەواتە مەنهەج وبنەماکانیان حسێبە. ئەو هەڵانەی لەگەڵ مەنهەج وبنەماکان یەکدەگرێتەوە وپشتگیری دەکات ئەوە دەتوانی مەنهەجەکەی پێ تاوانبار بکەیت ئەگەرنا ستەم دەکەیت مەنهەجەکە تاوانبار بکەیت.

٨. مێژو وواقیع ودەقەکان شاهیدن کە ئەهلی سوننەت وجەماعەت خۆیان قوربانی تەکفیر ودورخستنەوە وتوندوتیژی بون لەلایەن نەیارەکانیانەوە، بەڵکو لەلایەن عەقلانیەکانیشەوە! کێ بو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی تەکفیر کرد؟ کێ بو خستیە زیندان؟ کێ بو لێیدا وئەشکەنجەی دەدا تا بورانەوە وکەوتن؟ کێ ڕێگری لێکرد بڕوا بۆ حەج؟ کێ بو چەندین

شوێنکەوتەی کوشت؟؛ کێ ئەحمەدی کوڕی نەسر «النصر»ی مەروەزی کوشت بۆ ماوەیەکیش لە خاچدرا؟ وکێ چەندین زانای خستە زینـدان تـەنها لەبـەر ئەوەی نەیانوت قورئان دروستکراوی خوایە بەڵکو قسەی خوایە؟ کێ موچەی هەمویانی بڕی؟ کێ فەصڵی کردن لە کارەنیان؟ کێ تەکفیری کردن؟ کێ ئیبن تەیمیەی تەکفیرکرد؟ کێ سجنی ئیبن قـەییمی قوتـابی کـرد؟ کـێ لێـی دەدا ولەسەر چی؟ تا کۆتایی لیستێکی دورودرێژ.

کەواتە ئەهلی سوننەت وجەماعەت خۆیان قوربـانی دەسـتی تـەکفیرن، وئێستاش موسڵمانان لە واقعیاندا سەرنج بدرێ، دەبینی هەر خۆیان قوربانی دەستی ئەو کەسانەن کـە پێیـان ئـەوترێ: ئیرهـابی وتیرۆریسـت، هـەر بـە موسڵمانان ئەوترێ ئیرهابی، کەچی ئیرهابییەکەش هـەر موسـڵمان ئـەکوژێ، جا تەماشای ئەو مەتەڵە بکە. ئینجا سەیرێکی وڵاتانی ئیسـلام وسـەیرێکی وڵاتانی ئەوانیش بکە، ئێرە خەڵتانی خوێن بوە ولە خوێن سور بوە، ئـەولاش لە گڵۆپی سور وڕۆمانسی سور بوە؟!

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە لە ئاست دژیرانی ولەمەڕ تەکفیر

ئـیبن تیمیـە لـە بـەرگی ١٢ لاپـەڕە ٤٦٦ لـە «مجموع الفتاوی» ئەفـەرموێ: «وَلَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يُكَفِّرَ أَحَدًا مِنْ الْمُسْلِمِينَ وَإِنْ أَخْطَأَ وَغَلِطَ حَتَّى تُقَامَ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ وَتُبَيَّنَ لَهُ الْمَحَجَّةُ وَمَنْ ثَبَتَ إسْلَامُهُ بِيَقِينِ لَمْ يَزُلْ ذَلِكَ عَنْهُ بِالشَّكِّ؛ بَلْ لَا يَزُولُ إلَّا بَعْدَ إقَامَةِ الْحُجَّةِ وَإِزَالَةِ الشُّبْهَةِ».

واتە: «بۆ هیچ کەسێك نیە کەس لە موسڵمانان تەکفیر بکا یا هەڵەش بکا، یا غەڵەت بکا، هەتا بەڵگەی پیشان نەدرێ وهەقیقەتی بۆ ڕون نەکرێتەوە، [پاشان وتەیەکی ئاڵتونی ئەفەرموێ:] جا بۆیە هەرکەسێ بە دڵنیایی ویەقینەوە بچەسپێ موسڵمانە، بە گومان دەر ناکرێت».

هەروەها لە ب ٣ ل ٢٨٢ی هەمان کتێب، ئەفەرموێ: «**وَلَا يَجُوزُ تَكْفِيرُ الْمُسْلِمِ بِذَنْبٍ فَعَلَهُ وَلَا بِخَطَأٍ أَخْطَأَ فِيهِ كَالْمَسَائِلِ الَّتِي تَنَازَعَ فِيهَا أَهْلُ الْقِبْلَةِ**».

واتە: «دروست وجائیز نیە، تەکفیری موسڵمان بکەی بەهۆی تاوانێکەوە ئەنجامی داوە، یا بەهۆی هەڵەیەکەوە **وەکو ئەو پرسانەی کە ئەهلی قیبلە ڕاجیاوازیان لەبارەوە هەیە**». ئەمەکە دەڵێ ئەو مەسەلە وایە، ئەوی تریان دەڵێ: نەخێر ئاوها نیە وئاوهایە..

هەروەها لە ب ٣ ل ٢٢٩ی هەمان کتێب ئەفەرموێ: «**هَذَا مَعَ أَنِّي دَائِمًا وَمَنْ جَالَسَنِي يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنِّي: أَنِّي مِنْ أَعْظَمِ النَّاسِ نَهْيًا عَنْ أَنْ يُنْسَبَ مُعَيَّنٌ إلَى تَكْفِيرٍ وَتَفْسِيقٍ وَمَعْصِيَةٍ، إلَّا إذَا عُلِمَ أَنَّهُ قَدْ قَامَتْ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ الرسالية الَّتِي مَنْ خَالَفَهَا كَانَ كَافِرًا تَارَةً وَفَاسِقًا أُخْرَى وَعَاصِيًا أُخْرَى وَإِنِّي أُقَرِّرُ أَنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ خَطَأَهَا: وَذَلِكَ يَعُمُّ الْخَطَأَ فِي الْمَسَائِلِ الْخَبَرِيَّةِ الْقَوْلِيَّةِ وَالْمَسَائِلِ الْعَمَلِيَّةِ. وَمَا زَالَ السَّلَفُ يَتَنَازَعُونَ فِي كَثِيرٍ مِنْ هَذِهِ الْمَسَائِلِ وَلَمْ يَشْهَدْ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَلَى أَحَدٍ لَا بِكُفْرِ وَلَا بِفِسْقٍ وَلَا مَعْصِيَةٍ**».

واتە: «لەگەڵ ئەوەشدا، من بەردەوام وهەرکەسیش لەگەڵم دانیشتبێ ئەوە باش ئەزانێت: من لەو کەسانەم زۆرترین ڕێگری دەکەم لەوەی دیاریکراوێك تەکفیر یا تەفسیق بکرێ یا تاوانبار بکرێت، مەگەر زانرا کە بەڵگەی پێگەیشتوە وبۆی ڕونکراوەتەوە ڕونکردنەوەی قورئان ئاسا، کە هەرکەس پێچەوانەی بوەستێتەوە جار وا هەیە کافر دەبێت وجاری واش هەیە فاسق وجاری واش هەیە تاوانبار».

هەروەها لە ب ١٢ ل ٤٨٧ هەمان کتێب ئەفەرموێ: «وَلَمْ يَتَدَبَّرُوا أَنَّ التَّكْفِيرَ لَهُ شُرُوطٌ وَمَوَانِعُ قَدْ تَنْتَفِي فِي حَقِّ الْمُعَيَّنِ وَأَنَّ تَكْفِيرَ الْمُطْلَقِ لَا يَسْتَلْزِمُ تَكْفِيرَ الْمُعَيَّنِ إلَّا إذَا وُجِدَتْ الشُّرُوطُ وَانْتَفَتْ الْمَوَانِعُ يُبَيِّنُ هَذَا أَنَّ الْإِمَامَ أَحْمَد وَعَامَّةَ الْأَئِمَّةِ: الَّذِينَ أَطْلَقُوا هَذِهِ العمومات لَمْ يُكَفِّرُوا أَكْثَرَ مَنْ تَكَلَّمَ بِهَذَا الْكَلَامِ بِعَيْنِهِ».

واتە: «ئەوانە تێڕا نەماون کە تەکفیر کومەڵێ مەرج وکۆمەڵێ ڕێگری هەیە، جاری وا هەیە لە کەسێکی دیاریکراودا فەراهەم نابێت، هەروەها کە تەکفیرکردنی ڕەها[1] لازمەکەی ئەوە نیە دیاریکراوێك[2] ئەوەی کرد پێی کافر ببێ[3]، مەگەر مەرجەکان فەراهەم بن وڕێگرەکان نەمێنن، ئەوەی ئەم

(١) «التكفير المطلق» واتە: تكفير النوع أو الفعل، وەك بڵێی: فلاَن کار یان فلان شت کوفرە.

(٢) «التكفير المعين» واتە: تكفير العين أو الفاعل، وەك بڵێی: فلاَن کەس کافرە.

(٣) بۆ نمونە: ئەوترێ هەرکەسێ فلاَن قسە بکا کافرە، ڕاستە، بەلاَم زەید ناوێك -بۆ نمونە- کە ئەو قسە دەکات کافری ناکەین یەکسەر، کەواتە لازمی ئەم قسەیەمان ئەوە نیە: مادام ئەو قسە کوفرە ئەم کەسەش کافرە، ئەمە بریتیە لە «المطلق والمعين».

قسه ڕوندەکاتەوە ئەوەیە: پێشەوا ئەحمەد وزۆربەی پێشەوایان ئەوانەی ئەم جۆرە وتە گشتیانانەیان[١] فەرموە، ئەو کەسانەیان کافر نەکردوە کە ئەم قسانەیان کردوە)).

هەروەها لە ب ٣ ل ٢٣٠ هەمان کتێب ئەفەرموێ: ((وَكُنْت أُبَيِّنُ لَهُمْ أَنَّمَا نُقِلَ لَهُمْ عَنْ السَّلَفِ وَالْأَئِمَّةِ مِنْ إطْلَاقِ الْقَوْلِ بِتَكْفِيرِ مَنْ يَقُولُ كَذَا وَكَذَا فَهُوَ أَيْضًا حَقٌّ، لَكِنْ يَجِبُ التَّفْرِيقُ بَيْنَ الْإِطْلَاقِ وَالتَّعْيِينِ. وَهَذِهِ أَوَّلُ مَسْأَلَةٍ تَنَازَعَتْ فِيهَا الْأُمَّةُ مِنْ مَسَائِلِ الْأُصُولِ الْكِبَارِ وَهِيَ مَسْأَلَةُ: ((الْوَعِيدِ)) فَإِنَّ نُصُوصَ الْقُرْآنِ فِي الْوَعِيدِ مُطْلَقَةٌ كَقَوْلِهِ: ﴿إنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا﴾ الْآيَةَ، وَكَذَلِكَ سَائِرُ مَا وَرَدَ: مَنْ فَعَلَ كَذَا فَلَهُ كَذَا. فَإِنَّ هَذِهِ مُطْلَقَةٌ عَامَّةٌ. وَهِيَ بِمَنْزِلَةِ قَوْلِ مَنْ قَالَ مِنْ السَّلَفِ مَنْ قَالَ كَذَا: فَهُوَ كَذَا. ثُمَّ الشَّخْصُ الْمُعَيَّنُ يلتغي حُكْمُ الْوَعِيدِ فِيهِ: بِتَوْبَةِ أَوْ حَسَنَاتٍ مَاحِيَةٍ أَوْ مَصَائِبَ مُكَفِّرَةٍ أَوْ شَفَاعَةٍ مَقْبُولَةٍ)).

واتە: ((ومن بۆم ڕوندەکردنەوە: ئەوەی لە سەلەف وپێشەوایانەوە دەگێڕدرێتەوە لە: بە ڕەهایی تەکفیرکردنی ئەوەی ئاوها وئاوها دەڵێ، کە بەڵێ ئەوەش حەقە، بەڵام ئەبێت جیاوازی بکرێ لە نێوان ڕەهایی ودیاریکراوی. ئەمەش یەکەم مەسەلە بو لە مەسەلە بنچینەییە گەورەکان

(١) مەبەستی وتەی: هەرکەس بڵێ: قورئان مەخلوقە کافرە وهاوشێوەی ئەم قسەیە. بۆ نمونە: وتویانە؛ هەرکەس بڵێ: قورئان مەخلوقە کافرە، خەڵکانێکیش هەبون لە هەر کەس زیاتر وتویانە وبەرگریشیان لێکردوە وئازاری خەڵکیان لەسەر داوە، پێشیان نەوتون: کافر، کەواتە حوکمەکە بە ڕەهایی جیاوازە لە حوکم بە تایبەتی.

که جیاوازی کەوتە ناو ئوممەتەوە بە هۆیەوە، ... پاشان ئـەبێت ئـەوە بـزانین کەسی دیـاریکراو حـوکمی ئـەو هەڕەشـانەی دەرهـەق هەڵدەوەشـێتەوە بـە تەوبەکردن یان کۆمەڵێ چاکە کە خراپـەکانی دەسـڕنەوە یـان موسـیبەتانێك تاوان دەسڕنەوە، یان شەفاعەتێکی وەرگیراو».

تەنانەت باسی ئەوە دەکات کە لەم مەسەلەدا تـەنها مـەنهجی ئـەهلی سوننەت وجەماعە مەنهەجێکی ڕێك ومیانڕەوە، هی ئەوانی تر بە هەوەسـە ولەسەر بچوکترین شت یەکتر تەکفیر وتەبدیع وتەفسیق دەکەن:

وەك ئەفـەرموێ: «فَمِنْ عُيُوبِ أَهْلِ الْبِدَعِ تَكْفِيرُ بَعْضِهِمْ بَعْضًا، وَمِنْ مَمَادِحِ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّهُمْ يُخَطِّئُونَ وَلَا يُكَفِّرُونَ. وَسَبَبُ ذَلِكَ أَنَّ أَحَدَهُمْ قَدْ يَظُنُّ مَا لَيْسَ بِكَفْرٍ كُفْرًا، [وَقَدْ يَكُونُ كُفْرًا] لِأَنَّهُ تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ تَكْذِيبٌ لِلرَّسُولِ وَسَبٌّ لِلْخَالِقِ، وَالْآخَرُ لَمْ يَتَبَيَّنْ لَهُ ذَلِكَ، فَلَا يَلْزَمُ إِذَا كَانَ هَذَا الْعَالِمُ بِحَالِهِ يَكْفُرُ إِذَا قَالَهُ، أَنْ يَكْفُرَ مَنْ لَمْ يَعْلَمْ بِحَالِهِ»[(١)].

واتە: «لەو شتانەی مایەی عەیب وکەموکورتی بیدعەچیەکانە تـەکفیری یەکتر ئەکەن، ولەو شتانەشی جێی شانازی زانایانە ئەوەیە: یـەکتر بـە هەڵـە دادەنێن، بەس تەکفیر ناکەن، ..».

هەروەها ئەفەرموێ[(٢)]: «ثُمَّ قُلْت لَهُمْ: وَلَيْسَ كُلُّ مَنْ خَالَفَ فِي شَيْءٍ مِنْ هَذَا الِاعْتِقَادِ يَجِبُ أَنْ يَكُونَ هَالِكًا فَإِنَّ الْمُنَازِعَ قَدْ يَكُونُ مُجْتَهِدًا مُخْطِئًا

---

(١) «منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة القدرية» (٥/٢٥١).
(٢) «مجموع الفتاوى» (٣/١٧٩).

يَغْفِرُ اللَّهُ خَطَأَهُ وَقَدْ لَا يَكُونُ بَلَغَهُ فِي ذَلِكَ مِنْ الْعِلْمِ مَا تَقُومُ بِهِ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ وَقَدْ يَكُونُ لَهُ مِنْ الْحَسَنَاتِ مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ سَيِّئَاتِهِ، وَإِذَا كَانَتْ أَلْفَاظُ الْوَعِيدِ الْمُتَنَاوَلَةُ لَهُ لَا يَجِبُ أَنْ يَدْخُلَ فِيهَا الْمُتَأَوِّلُ وَالْقَانِتُ وَذُو الْحَسَنَاتِ الْمَاحِيَةِ وَالْمَغْفُورُ لَهُ وَغَيْرُ ذَلِكَ: فَهَذَا أَوْلَى، بَلْ مُوجِبُ هَذَا الْكَلَامِ أَنَّ مَنْ اعْتَقَدَ ذَلِكَ نَجَا فِي هَذَا الِاعْتِقَادِ وَمَنْ اعْتَقَدَ ضِدَّهُ فَقَدْ يَكُونُ نَاجِيًا وَقَدْ لَا يَكُونُ نَاجِيًا كَمَا يُقَالُ مَنْ صَمَتَ نَجَا».

واتە: «[کە ڕەخنەیان لێگرتوە لەسەر ئەوەی لە عەقیدە واستیەکە ئەڵێ: ئەمە عەقیدەی کۆمەڵی ڕزگار بوە، کەواتە ئەوەی بڕوای پێنەبێت تیاچوە، لەکاتێکدا چەندین لە زانایانمان عەقیدەیان لە هەندێك شتدا بەم شێوازە نەبوە، ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێ:] پاشان پێم وتن: مەرج نیە هەرکەس هاوڕا نەبو لەسەر شتانێکی ئەم بیروباوەڕە [مەبەستی عەقیدەی واستیەیە] ئەوا ئەبێت هالك وتیاچو بێت، چونکە لەوانەیە موخالفەکە ئیجتهادی کردبێت وهەڵەی کردبێت، خوا لە هەڵەکەی ببورێت، یا لەوانەیە زانستێکی وای لەو بارەوە پێنەگەیشتبێ ببێتە بەڵگە بەسەریەوە، یان لەوانەیە کۆمەڵێك چاکەی هەبێت بە هۆیەوە خوا خراپەکانی بسڕێتەوە، با دەقەکانی هەڕەشەش بیگرنەوە مەرج نیە کەسی تەئویلکەر وبۆ خوا سوڵحاو عابد وخاوەن چاکە خراپە سڕێنەرەوەکان وجگە لەمانەش بگرێتەوە، دەی لێرە لەپێشترە».

هەروەها ئەفەرموێ[1]: «وأئمة السنة والجماعة وأهل العلم والإيمان؛ فيهم العلم والعدل والرحمة؛ فيعلمون الحق الذي يكونون به موافقين للسنة سالمين من البدعة، ويعدلون على من خرج منها ولو ظلمهم، كما قال تعالى: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ [المائدة:٨]، ويرحمون الخلق فيريدون لهم الخير والهدى والعلم، لا يقصدون الشر لهم ابتداء؛ بل إذا عاقبوهم وبيَّنوا خطأهم وجهلهم وظلمهم؛ كان قصدهم بذلك بيان الحق ورحمة الخلق، والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر، وأن يكون الدين كله لله وأن تكون كلمة الله هي العليا».

واتە: «وپێشەوایانی ئەهلی سوننەت وجەماعەت وخاوەن زانا وخاوەن ئیمانەکان بە علم وبە ڕەحمن ودادگەرییان تێدایە، ئەو هەقە دەزانن کە بە هۆیەوە لەسەر سوننەت دەبن ولە بیدعەوە دور دەبن، ودادگەریشن بەرامبەر ئەوانەی لێی دەردەچن با ستەمیش لە ئەهلی سوننەت بکەن، وەك پەروەردگار ئەفەرموێ: ﴿ئەی ئیمانداران هەڵسن بە هەقوتن، لە پێناوی خوادا، شایەتی بدەن بە دادگەری وهەق، وبا ڕقلێبونی خەڵكانێك واتان لێنەکات دادگەر نەبن، دادگەر بن لە نێوان دۆست ودوژمن وەك یەك، ئەم دادگەریە نزیکترە لە ترسان لەخواوە، ووریا بن ستەم نەکەن خوا ئاگای لێتانە

(١) «الاستغاثة في الرد على البكري» (ص٢٥١).

وپاداشتان دەداتەوە لەسەر کارەکانتان﴾، وئەهلی عیلم ڕەحم بە خەڵك ئەکەن، خێر وهیدایەت وعلمیان بۆ خەڵك ئەوێت، مەبەستیان شەڕ وزیانی خەڵك نیە لەبەر خودی شەڕ، ئەگەریش سزایان بدەن وهەڵە ونەزانی وستەمیان ڕون بکەنەوە؛ ئەوە مەبەستیان ڕونکردنەوەی هەق وبەزەیی هاتنەوەیە بە خەڵك، وفەرمان کردنە بە چاکە ونەهیکردنە لە خراپە، وبۆ ئەوەیە دینداری تەنها بۆ خوا بێت، ووتەی خوا بالاّ بێت».

هەروەها ئەفەرموێ[1]: «وَأَمَّا التَّكْفِيرُ: فَالصَّوَابُ أَنَّهُ مَنْ اجْتَهَدَ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ وَقَصَدَ الْحَقَّ فَأَخْطَأَ: لَمْ يُكَفَّرْ؛ بَلْ يُغْفَرُ لَهُ خَطَؤُهُ، وَمَنْ تَبَيَّنَ لَهُ مَا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ فَشَاقَّ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَاتَّبَعَ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ: فَهُوَ كَافِرٌ. وَمَنْ اتَّبَعَ هَوَاهُ وَقَصَّرَ فِي طَلَبِ الْحَقِّ وَتَكَلَّمَ بِلَا عِلْمٍ: فَهُوَ عَاصٍ مُذْنِبٌ. ثُمَّ قَدْ يَكُونُ فَاسِقًا وَقَدْ تَكُونُ لَهُ حَسَنَاتٌ تَرْجَحُ عَلَى سَيِّئَاتِهِ. فَالتَّكْفِيرُ يَخْتَلِفُ بِحَسَبِ اخْتِلَافِ حَالِ الشَّخْصِ فَلَيْسَ كُلُّ مُخْطِئٍ وَلَا مُبْتَدَعٍ وَلَا جَاهِلٍ وَلَا ضَالٍّ يَكُونُ كَافِرًا؛ بَلْ وَلَا فَاسِقًا بَلْ وَلَا عَاصِيًا لَا سِيَّمَا فِي مِثْلِ «مَسْأَلَةِ الْقُرْآنِ» وَقَدْ غَلِطَ فِيهَا خَلْقٌ مِنْ أَئِمَّةِ الطَّوَائِفِ الْمَعْرُوفِينَ عِنْدَ النَّاسِ بِالْعِلْمِ وَالدِّينِ، وَغَالِبُهُمْ يَقْصِدُ وَجْهًا مِنْ الْحَقِّ فَيَتَّبِعُهُ وَيَعْزُبُ عَنْهُ وَجْهٌ آخَرُ لَا يُحَقِّقُهُ فَيَبْقَى عَارِفًا بِبَعْضِ الْحَقِّ جَاهِلًا بِبَعْضِهِ؛ بَلْ مُنْكِرًا لَهُ، وَمِنْ هَهُنَا نَشَأَ نِزَاعُهُمْ..». واتە: «سەبارەت بە تەکفیرکردن، بۆچونە ڕاستەکە ئەوەیە: هەرکەس لە ئوممەتی موحەممەد ﷺ ئیجتیهادێك

---

(١) «مجموع الفتاوى» (١٢/١٨٠).

بکا ومەبەستی بێت حەق بپێکێت بەڵام بکەوێتە هەڵەوە، ئەوە تەکفیر ناکرێ، بەڵکو خوا لە هەڵەکەی ئەبورێ، بەڵام هەرکەس ئەوەی بۆ ڕون ببێتەوە کە پەیامبەر ﷺ هێناویەتی بەڵام دژی بوەستێتەوە، ودوای بۆ ڕونبونەوەی هەق بڕوا شوێن ڕێگای جگە لە ئیمانداران بکەوێت: ئەوە کافرە، ئەوەشی شوێن هەوەسی بکەوێ وکەم تەرخەمی بکا لە هەقویستی وبە بێ زانست قسە بکا: ئەوە تاوانبارە. لەوانەشە فاسق بێت، لەوانەشە کومەڵێك چاکەی هەبێت لە خراپەکانی قورستر بێت. کەواتە تەکفیر دەگۆڕێت بە گوێرەی حاڵی ئەو کەسەکە، جا مەرج نیە نە هەمو هەڵەکەرێك نە بیدعەچیەك نە نەزانێك نە گومڕایەك: کافر بێت، بەڵکو مەرج نیە فاسق یا سەرپێچیکاریش بێت..».

هەروەها ئەفەرموێ[١]: «وَهَكَذَا الْأَقْوَالُ الَّتِي يَكْفُرُ قَائِلُهَا قَدْ يَكُونُ الرَّجُلُ لَمْ تَبْلُغْهُ النُّصُوصُ الْمُوجِبَةُ لِمَعْرِفَةِ الْحَقِّ وَقَدْ تَكُونُ عِنْدَهُ وَلَمْ تَثْبُتْ عِنْدَهُ أَوْ لَمْ يَتَمَكَّنْ مِنْ فَهْمِهَا وَقَدْ يَكُونُ قَدْ عَرَضَتْ لَهُ شُبُهَاتٌ يَعْذُرُهُ اللَّهُ بِهَا فَمَنْ كَانَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ مُجْتَهِدًا فِي طَلَبِ الْحَقِّ وَأَخْطَأَ فَإِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ لَهُ خَطَأَهُ كَائِنًا مَا كَانَ، سَوَاءٌ كَانَ فِي الْمَسَائِلِ النَّظَرِيَّةِ أَوْ الْعَمَلِيَّةِ هَذَا الَّذِي عَلَيْهِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ. وَجَمَاهِيرُ أَئِمَّةِ الْإِسْلَامِ وَمَا قَسَّمُوا الْمَسَائِلَ إلَى مَسَائِلِ أُصُولٍ يَكْفُرُ بِإِنْكَارِهَا وَمَسَائِلِ فُرُوعٍ لَا يَكْفُرُ بِإِنْكَارِهَا».

---

(١) «مجموع الفتاوى» (١٢/١٨٠).

واتە: «بە هەمان شێوە ئەو وتانەی کە بە وتنی خاوەنەکەی کافر ئـەبێ، لەوانەیە کابرا ئەو دەقانەی پێنەگەشتبێ کە ببنە مایەی ڕونکردنەوەی هـەق بۆی، لەوانەشە پێی گەشتبێ بەڵام لای نەچەسپا بێت، یان بۆی نەکراوە لێـی تێبگات، یان لەوانەیە هەندێ شـوبهەی تـوش هـاتبێ، خـوای گـەورە بـەو هۆیەوە بیانوی وەرگرێ، **جا هەرکەس لە ئیمانداران ئیجتیهادێك بکـا بـۆ هەقویستی بەڵام نەیپێکێ، ئەوا خوا لە هەڵەکـەی ئـەبورێ هەرکەسـێك بێت، ئیتر لە بابەتە تیۆریەکان بێت یا کرداریەکان، ئەمـەش مەنهـەجی هاوەڵانی پەیامبەر ﷺ، وجمهور وزۆربەی پێشەوایانی ئیسلامە**».

کام مەنهەج؟ کە هەرکەس هەڵەیەکی کرد، تێیدا حەقویست بوە، بـەڵام نەپێکاوە، ئەوە خوای پەروەدگار لە تاوانەکەی ئەبورێ هەر کەسێ بێ.

پاشـان زیـاتر هەڵوێسـتی میـانڕەوی ئـەهلی سـوننەت ڕوندەکاتـەوە وئەفـەرموێ[1]: «وَلَا رَيْبَ أَنَّ الْمُسْلِمَ الْعَالِمَ الْعَادِلَ أَعْدَلُ عَلَيْهِمْ وَعَلَى بَعْضِهِمْ مِنْ بَعْضٍ. وَالْخَوَارِجُ تُكَفِّرُ أَهْلَ الْجَمَاعَةِ، وَكَذَلِكَ أَكْثَرُ الْمُعْتَزِلَةِ يُكَفِّرُونَ مَنْ خَالَفَهُمْ وَكَذَلِكَ أَكْثَرُ الرَّافِضَةِ وَمَنْ لَمْ يُكَفِّرْ فُسِّقَ. وَكَذَلِكَ أَكْثَرُ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ يَبْتَدِعُونَ رَأْيًا، وَيُكَفِّرُونَ مَنْ خَالَفَهُمْ فِيهِ، وَأَهْلُ السُّنَّةِ يَتَّبِعُونَ الْحَقَّ مِنْ رَبِّهِمُ الَّذِي جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ، وَلَا يُكَفِّرُونَ مَنْ خَالَفَهُمْ فِيهِ، بَلْ هُمْ أَعْلَمُ بِالْحَقِّ وَأَرْحَمُ بِالْخَلْقِ، كَمَا وَصَفَ اللَّهُ بِهِ الْمُسْلِمِينَ بِقَوْلِهِ: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ

---

(١) «منهاج السنة» (١٥٨/٥).

**أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾** [آل عِمْران:١١٠].. **وَأَهْلُ السُّنَّةِ نَقَاوَةُ الْمُسْلِمِينَ، فَهُمْ خَيْرُ النَّاسِ لِلنَّاسِ**».

ئەفەرموێ: «وخەوارج تەكفیری ئەهلی سوننەت وجەماعەت ئەكەن، بە هەمان شێوە موعتەزیلە، هەركەس هاوبیریان نەبێت تەكفیری دەكەن، بە هەمان شێوە زۆربەی شیعەكان، ئەوانەشیان تەكفیر نەكەن تەفسیق ئەكەن، بە هەمان شێوە زۆربەی بیدعەچیەكان ئەڕۆن ڕاوبۆچونێك دائەهێنن، ئینجا هەركەس لەوەدا هاوڕایان نەبێت تەكفیری ئەكەن، بەڵام ئەهلی سوننەت وجەماعەت شوێنی حەقەكە ئەكەون كە لە خواوە بۆ پەیامبەرەكەیان هاتوە، وموخالفەكانی خۆیان بەكافر دانانێن «**بَلْ هُمْ أَعْلَمُ بِالْحَقِّ وَأَرْحَمُ بِالْخَلْقِ**» **بەڵكو ئەوان زاناترینن بە ڕاستی وهەق وبەڕەحمترینن بە خەڵك**».

هەروەها ئەفەرموێ[1]: «**وَالْخَوَارِجُ هُمْ أَوَّلُ مَنْ كَفَّرَ الْمُسْلِمِينَ، يُكَفِّرُونَ بِالذُّنُوبِ، وَيُكَفِّرُونَ مَنْ خَالَفَهُمْ فِي بِدْعَتِهِمْ وَيَسْتَحِلُّونَ دَمَهُ وَمَالَهُ. وَهَذِهِ حَالُ أَهْلِ الْبِدَعِ يَبْتَدِعُونَ بِدْعَةً وَيُكَفِّرُونَ مَنْ خَالَفَهُمْ فِيهَا. وَأَهْلُ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ يَتَّبِعُونَ الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَيَتَّبِعُونَ الْحَقَّ وَيَرْحَمُونَ الْخَلْقَ**».

واتە: «وخەوارج یەكەم كەس بون موسڵمانانیان كافر كرد، بە تاوان خەڵك كافر دەكەن، وهەركەس ڕاجیاوازیان بێ لە بیدعەكەیان تەكفیری دەكەن، وخوێن وماڵی حەڵاڵ دەكەن، ئەمەش حاڵی بیدعەچیەكانە

(١) «مجموع الفتاوى» (٢٧٩/٣).

بیدعەیەك دادەهێنن وئەوانەی هاوڕایان نەبن تەكفیری دەكەن، بەڵام ئەهلی سوننەت وجەماعەت شوێنی قورئان وسوننەت دەكەون وگوێڕایەڵی خوا وپەیامبەر دەكەن، بۆیە شوێنی هەق دەكەون، وبەزەییشیان بە خەڵكدا دێتەوە)).

باسی ئەوەشمان بۆ دەكات كە هەڵوێستی چۆنە بەرامبەر ئەو كۆمەڵ وگروپ وكەسانەی تەكفیریان كردوە، تا جوان بۆ هەمو لایەك ڕون ببێتەوە كە ئەم پیاوە بۆ خوا سوڵحاو بوە تەكفیری بە تەكفیر نەفرۆشتوە، جا ئەفەرموێ[1]: ((وَمِمَّا يَجِبُ أَنْ يُعْلَمَ أَنَّ الَّذِي يُرِيدُ أَنْ يُنْكِرَ عَلَى النَّاسِ لَيْسَ لَهُ أَنْ يُنْكِرَ إلَّا بِحُجَّةِ وَبَيَانٍ، إذْ لَيْسَ لِأَحَدِ أَنْ يُلْزِمَ أَحَدًا بِشَيْءِ وَلَا يَحْظُرَ عَلَى أَحَدٍ شَيْئًا بِلَا حُجَّةٍ خَاصَّةٍ، إلَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُبَلِّغُ عَنْ اللَّهِ، الَّذِي أَوْجَبَ عَلَى الْخَلْقِ طَاعَتَهُ فِيمَا أَدْرَكَتْهُ عُقُولُهُمْ وَمَا لَمْ تُدْرِكْهُ وَخَبَرُهُ مُصَدَّقٌ فِيمَا عَلِمْنَاهُ وَمَا لَمْ نَعْلَمْهُ.. هَذَا وَأَنَا فِي سعَةِ صَدْرٍ لِمَنْ يُخَالِفُنِي فَإِنَّهُ وَإِنْ تَعَدَّى حُدُودَ اللَّهِ فِيَّ بِتَكْفِيرِ أَوْ تَفْسِيقٍ أَوْ افْتِرَاءٍ أَوْ عَصَبِيَّةٍ جَاهِلِيَّةٍ، فَأَنَا لَا أَتَعَدَّى حُدُودَ اللَّهِ فِيهِ، بَلْ أَضْبُطُ مَا أَقُولُهُ وَأَفْعَلُهُ، وَأَزِنُهُ بِمِيزَانِ الْعَدْلِ وَأَجْعَلُهُ مُؤْتَمًّا بِالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَهُ اللَّهُ وَجَعَلَهُ هُدًى لِلنَّاسِ حَاكِمًا فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ)).

واتە: ((وپێویستە ئەوەش بزانرێت ئەو كەسەی ئەیەوێت نكوڵی لە خەڵك بكات بۆی نیە نكوڵی بكات مەگەر بە بەڵگە ودەلیل نەبێت...

(١) ((مجموع الفتاوى)) (٢٤٥/٣).

ومن سنگم فراوانه بەرامبەر هەمو ئەوانەی نەیاری منن، با سنوری خواش بشکێنێ دەرحەقم بە تەکفیرکردنم یان تەفسیق کردنم یا درۆهەڵواسین بە دەممەوە یا دەمارگیری نەفامانە بکا لە دژم، بەڵام من سنوری خوای لە ئاست نابەزێنم، بەڵکو زەبتی ئەو قسە وکردارانە ئەکەم کە ئەنجامی دەدەم، وبە تەرازوی عەدل دەیپێوم، ووای لێدەکەم شوێنی قورئان وسوننەت بکەوێ وبەگوێرەی ئەوان ئەیکەم».

هەروەها ئەفەرموێ[1]: «فلهذا كان أهل العلم والسنة لا يكفّرون من خالفهم، وإن كان ذلك المخالف يكفرهم، لأن الكفر حكم شرعي فليس للإنسان أن يعاقب بمثله، كمن كذب عليك وزنى بأهلك؛ ليس لك أن تكذب عليه وتزني بأهله، لأن الكذب والزنا حرام لحق الله. وكذلك التكفير حق لله فلا يكفر إلا من كفره الله ورسوله».

واتە: «**هەربۆیە خاوەن علیمەکان وئەهلی سوننەت هەرکەس نەیاریان بێت تەکفیری ناکەن، با ئەو نەیارەش تەکفیریان بکات**، چونکە کوفر حوکمێکی شەرعیە وبۆ مرۆڤ نیە بە بەرامبەری خۆی سزای لەسەر بدات، وەك ئەوەی کەسێك درۆت بە دەمەوە بکات یان زینا لەگەڵ خێزانەکەت بکات، بۆت نیە درۆی بە دەمەوە بکەیت یان زینا لەگەڵ خێزانەکەی بکەی، چونکە درۆ وزینا حەرامن وهەقی خوایان لەسەرە،

(١) «الاستغاثة في الرد على البكري» (ص٢٥٢).

بەهەمان شێوە تەكفیر هەقی خوایە ونابێت كەس كافر بكرێت مەگەر یەكێك خوا وپەیامبەرەكەی تەكفیری بكات».

ئەمەش تەنها قسەیەكی پەتی ومەسەلەیەكی تیۆری نیە لەلایـەن ئـیبن تەیمیەوە، بەڵكو لە واقعیشدا هەر وا بوە، چەند جار لێی درا، سجن كرا، سزا درا، تەكفیر كرا، لە هەمو ئەمانەدا هەم تەكفیری نەكردن وهەم لێیان بورا:

لــە «الاستغاثة في الرد على البكري» (ل ٢٥٣-٢٥٤) ئەفـەرموێ: «ولهذا كنت أقول للجهمية -من الحلولية والنفاة الذين نفوا أن يكون الله تعالى فوق العرش- لما وقعت محنتهم: أن لو وافقتكم كنت كافراً؛ لأني أعلم أن قولكم كفر، وأنتم عندي لا تكفرون لأنكم جهال، وكان هذا خطاباً لعلمائهم وقضاتهم وشيوخهم وأمرائهم. وأصل جهلهم شبهات عقلية حصلت لرؤوسهم في قصور من معرفة المنقول الصحيح والمعقول الصريح الموافق له، فكان هذا خطابنا».

واتــە: «هــەر بۆیــە كــە میحنەتەكــە ڕویــدا، بــە جەهمیــە حلــولی ونەفیكەرەكانم دەوت -ئەوانەی كە نكوڵی دەكەن خوا لەسەر عەرش بێـت-، پێم وتن: ئەگەر من هاوڕای ئێوە بم لەو بۆچونانەی ئێوەی لەسەرن، ئەوە كافر ئەبم، چونكە من ئەزانم ئەو قسـە كـوفرە، ئێـوەش بـە كـافر نـازانم چـونكە نازانن، كە وام وت، ڕوی دەمم لـە زانـا ودادوەر وشـێخ ودەسـەڵاتدارەكانیان بو».

نمونەیەکی تری زیندو ئەوەیە: کاتێك شێخ عەلی بەکری سۆفی هەستا بە تەکفیرکردنی ئیبن تەیمیە ودەستدرێژی جەستەیی کردە سەری، تەکفیری نەکرد ولێی بورا، وەك ئەفەرموێ -هەمان کتێب (ل ٢٥٤)-: «فلهذا لم يقابل جهله وافتراؤه بالتكفير بمثله، كما لو شهد شخص بالزور على شخص، أو قذفه بالفاحشة كذباً عليه لم يكن له أن يشهد عليه بالزور ولا أن يقذفه بالفاحشة».

واتە: «هەربۆیە لە بەرامبەر ئەو نەفامی ودرۆ هەڵبەستنەی بۆ ئێمە کردی، ڕوبەروی نەبوینەوە بە تکفیرکردنی وەك ئەو کردی، وەك چۆن کەسێك شایەتی درۆ بدات لەسەر کەسێك یان تۆمەتی زینا بخاتە پاڵی بە درۆوە، بۆی نیە لە بەرامبەردا بڕوا شایەتی درۆ بدات لەدژی یان بڕوا بە درۆوە تۆمەتی زینای بداتە پاڵ».

وڕوی دەمی دەکاتە سەرجەم گروپ ومەزهەبە ئیسلامیەکان وئەفەرموێ[١]: «وَلَا يَجُوزُ تَكْفِيرُ الْمُسْلِمِ بِذَنْبٍ فَعَلَهُ وَلَا بِخَطَأٍ أَخْطَأَ فِيهِ كَالْمَسَائِلِ الَّتِي تَنَازَعَ فِيهَا أَهْلُ الْقِبْلَةِ ... وَالْخَوَارِجُ الْمَارِقُونَ الَّذِينَ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِقِتَالِهِمْ قَاتَلَهُمْ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ أَحَدُ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ، وَاتَّفَقَ عَلَى قِتَالِهِمْ أَئِمَّةُ الدِّينِ مِنْ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ، وَلَمْ يُكَفِّرْهُمْ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَغَيْرُهُمَا مِنْ الصَّحَابَةِ، بَلْ جَعَلُوهُمْ مُسْلِمِينَ مَعَ قِتَالِهِمْ، وَلَمْ يُقَاتِلْهُمْ عَلِيٌّ حَتَّى سَفَكُوا

(١) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٨٣).

الدَّمَ الْحَرَامَ وَأَغَارُوا عَلَى أَمْوَالِ الْمُسْلِمِينَ، فَقَاتَلَهُمْ لِدَفْعِ ظُلْمِهِمْ وَبَغْيِهِمْ لَا لِأَنَّهُمْ كُفَّارٌ.

وَلِهَذَا لَمْ يَسْبِ حَرِيمَهُمْ وَلَمْ يَغْنَمْ أَمْوَالَهُمْ، وَإِذَا كَانَ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ ثَبَتَ ضَلَالُهُمْ بِالنَّصِّ وَالْإِجْمَاعِ لَمْ يُكَفَّرُوا مَعَ أَمْرِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ بِقِتَالِهِمْ، فَكَيْفَ بِالطَّوَائِفِ الْمُخْتَلِفِينَ الَّذِينَ اشْتَبَهَ عَلَيْهِمْ الْحَقُّ فِي مَسَائِلَ غَلِطَ فِيهَا مَنْ هُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ؟ فَلَا يَحِلُّ لِأَحَدٍ مِنْ هَذِهِ الطَّوَائِفِ أَنْ تُكَفِّرَ الْأُخْرَى وَلَا تَسْتَحِلَّ دَمَهَا وَمَالَهَا وَإِنْ كَانَتْ فِيهَا بِدْعَةٌ مُحَقَّقَةٌ فَكَيْفَ إذَا كَانَتْ الْمُكَفِّرَةُ لَهَا مُبْتَدِعَةً أَيْضًا؟ وَقَدْ تَكُونُ بِدْعَةُ هَؤُلَاءِ أَغْلَظَ وَالْغَالِبُ أَنَّهُمْ جَمِيعًا جُهَّالٌ بِحَقَائِقِ مَا يَخْتَلِفُونَ فِيهِ».

واته: «حەڵاڵ نیە بۆ هیچ کام لەو تایفە وگروپانە ئەوی تر کافر بکات وخوێن ومالّی حەڵاڵ بکات، با بە دڵنیاییەوە بیدعەشیان تێدا بێت، چ جای ئەوەی تەکفیرکەرەکە خۆیشی بیدعەچی بێت، لەوانەشە بیدعەی ئەمانە زۆر لەوەی ئەوان توندتر بێت، زۆربەی جاریش هەمویان جاهلن بە هەقیقەتی ئەو شتانەی جیاوازیان هەیە لە نێوان یەکتر».

هەروەها بە ڕونی باسی مەزهەبی سەلەف دەکات لەسەر ئەم بابەتە وئەفەرموێ[1]: «وَلَكِنَّ الْمَقْصُودَ هُنَا أَنَّ مَذَاهِبَ الْأَئِمَّةِ مَبْنِيَّةٌ عَلَى هَذَا التَّفْصِيلِ بَيْنَ النَّوْعِ وَالْعَيْنِ، وَلِهَذَا حَكَى طَائِفَةٌ عَنْهُمْ الْخِلَافَ فِي ذَلِكَ، وَلَمْ يَفْهَمُوا غَوْرَ قَوْلِهِمْ، فَطَائِفَةٌ تَحْكِي عَنْ أَحْمَد فِي تَكْفِيرِ أَهْلِ الْبِدَعِ رِوَايَتَيْنِ مُطْلَقًا، حَتَّى تَجْعَلَ الْخِلَافَ فِي تَكْفِيرِ الْمُرْجِئَةِ وَالشِّيعَةِ الْمُفَضِّلَةِ لِعَلِيٍّ،

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٢٣/٣٤٨-٣٤٥١).

وَرُبَّمَا رَجَّحَتْ التَّكْفِيرَ وَالتَّخْلِيدَ فِي النَّارِ، وَلَيْسَ هَذَا مَذْهَبَ أَحْمَد وَلَا غَيْرِهِ مِنْ أَئِمَّةِ الْإِسْلَامِ، بَلْ لَا يَخْتَلِفُ قَوْلُهُ أَنَّهُ لَا يُكَفِّرُ الْمُرْجِئَةَ الَّذِينَ يَقُولُونَ: الْإِيمَانُ قَوْلٌ بِلَا عَمَلٍ، وَلَا يُكَفِّرُ مَنْ يُفَضِّلُ عَلِيًّا عَلَى عُثْمَانَ، بَلْ نُصُوصُهُ صَرِيحَةٌ بِالِامْتِنَاعِ مِنْ تَكْفِيرِ الْخَوَارِجِ وَالْقَدَرِيَّةِ وَغَيْرِهِمْ. وَإِنَّمَا كَانَ يُكَفِّرُ الْجَهْمِيَّةَ الْمُنْكِرِينَ لِأَسْمَاءِ اللَّهِ وَصِفَاتِهِ؛ لِأَنَّ مُنَاقَضَةَ أَقْوَالِهِمْ لِمَا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ ﷺ ظَاهِرَةٌ بَيِّنَةٌ: وَلِأَنَّ حَقِيقَةَ قَوْلِهِمْ تَعْطِيلُ الْخَالِقِ وَكَانَ قَدْ اُبْتُلِيَ بِهِمْ حَتَّى عَرَفَ حَقِيقَةَ أَمْرِهِمْ وَأَنَّهُ يَدُورُ عَلَى التَّعْطِيلِ وَتَكْفِيرُ الْجَهْمِيَّة مَشْهُورٌ عَنْ السَّلَفِ وَالْأَئِمَّةِ. لَكِنْ مَا كَانَ يَكْفُرُ أَعْيَانُهُمْ فَإِنَّ الَّذِي يَدْعُو إلَى الْقَوْلِ أَعْظَمُ مِنْ الَّذِي يَقُولُ بِهِ وَالَّذِي يُعَاقِبُ مُخَالِفَهُ أَعْظَمُ مِنْ الَّذِي يَدْعُو فَقَطْ وَالَّذِي يُكَفِّرُ مُخَالِفَهُ أَعْظَمُ مِنْ الَّذِي يُعَاقِبُهُ وَمَعَ هَذَا فَالَّذِينَ كَانُوا مِنْ وُلَاةِ الْأُمُورِ يَقُولُونَ بِقَوْلِ الْجَهْمِيَّة: إنَّ الْقُرْآنَ مَخْلُوقٌ وَإِنَّ اللَّهَ لَا يُرَى فِي الْآخِرَةِ وَغَيْرُ ذَلِكَ. وَيَدْعُونَ النَّاسَ إلَى ذَلِكَ ويمتحنونهم وَيُعَاقِبُونَهُمْ إذَا لَمْ يُجِيبُوهُمْ وَيُكَفِّرُونَ مَنْ لَمْ يُجِبْهُمْ. حَتَّى أَنَّهُمْ كَانُوا إذَا أَمْسَكُوا الْأَسِيرَ لَمْ يُطْلِقُوهُ حَتَّى يُقِرَّ بِقَوْلِ الْجَهْمِيَّة: إنَّ الْقُرْآنَ مَخْلُوقٌ وَغَيْرُ ذَلِكَ. وَلَا يُوَلُّونَ مُتَوَلِّيًا وَلَا يُعْطُونَ رِزْقًا مِنْ بَيْتِ الْمَالِ إلَّا لِمَنْ يَقُولُ ذَلِكَ وَمَعَ هَذَا فَالْإِمَامُ أَحْمَد رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى تَرَحَّمَ عَلَيْهِمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ لِعِلْمِهِ بِأَنَّهُمْ لِمَنْ يُبَيِّنْ لَهُمْ أَنَّهُمْ مُكَذِّبُونَ لِلرَّسُولِ وَلَا جَاحِدُونَ لِمَا جَاءَ بِهِ وَلَكِنْ تَأَوَّلُوا فَأَخْطَئُوا وَقَلَّدُوا مَنْ قَالَ لَهُمْ ذَلِكَ».

پوختەکەی ئەمەیە: «خەڵکانێك لە بارەی تکفیری بیدعەچیەکانەوە دوو ڕیوایەت لە ئەحمەدە ئەگێڕنەوە، هەروەها لە هەندێ مەسەلەی تردا خیلافی لێوە دەگێڕدرێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا وردبییتەوە دەردەکەوێت ئەمە

نه مەزهەبی ئەحمەده نه مەزهەبی جگە لەویشە لە پێشەوایانی ئیسلام، بەڵکو ئەحمەد قسەکانی هەموی لەسەر ئەوەیە کەوا مورجئە کافر نین کە ئەشڵێن ئیمان: وتەی بێکردەوەیە، وتەکفیری کەسێك ناکات بڵێ: عەلی لە عوسمان باشترە، بەڵکو دەقەکانی ڕاشکاوە لە تەکفیر نەکردنی خەوارج وقەدەریەکان وهتد، تەنها لەبارەی جەهمیەکانەوە نەبێ تەکفیری کردون چونکە نکۆڵیان کردوە لە ناو وسیفاتەکانی خوا، قسەکانیشیان دژ وەستانەوە بوە بۆ قسەی خوا وپەیامبەرەکەی، چونکە حەقیقەتی قسەکەیان بریتیە لە پەکخستنی خالق، سەرباری ئەمەش پێشەوا ئەحمەد پێیانەوە گیرۆدە بو تا حەقیقەتیانی بۆ ڕون بویەوە، کە برتیە لە پەکخستن ونەفی، ئەوسا تکفیری کردن، وتەکفیردنیشیان وەنەبێ شتێك بێت تەنها ئەحمەد کردبێتی، بەڵکو تەکفیریان بەناوبانگە لە سەلەف وپێشەوایانەوە، بەڵام تاك تاکیانیان کافر نەکردوە، چونکە ئەو کەسەی بانگەشە بکات بۆ قەسەیەك، گەورەترە لەوەی تەنها بڕوای پێ هەبێت، وئەوەی موخالیفەکانی ئەو قسەیە سزا بدات گەورە ترە لەوەی تەنها بانگەشەی بۆ بکات، وئەوەی تەکفیری موخالفین بکات گەورەترە لەوەی تەنها سزا بدات لەسەری، سەرباری ئەوەش دەسەڵاتداران جەهمی بون وخەڵکیان بۆلا بانگئەکرد ولەسەریشی خەڵکیان سزا ئەدا، وتەکفیریشیان دەکرد، تەنانەت هەرکەس بڕوای ئەوانی نەبوایە پۆستی حکومەتیان پێنەدەدا، ودایان نەدەمەزراند، کەچی پێشەوا ئەحمەد دوعای لێخۆشبونی بۆ ئەکردن -کە دروست نیە دوعای لێخۆشبون بۆ کافر بکرێ-،

بۆ؟ چونکه ئەحمەد ئەیزانی ئەمانە نازانن کە پەیامبــەر بــە درۆ ئەخەنــەوە، بۆیە تکفیری نەکردن، بەڵکو تەئویلیان کردوە وهەڵــەیان کــردوە، وئــەمانیش چاویان لە پێش خۆیان کردوە».

هەر لە ڕونکردنەوەی زیاتری ئەو بابەتە، لــە: «مجموع الفتاوى» ب١٢ ل٤٨٨، کە پێشتر بەشێکیمان گواستەوە، ئەمەش بەشێکی تریــەتی، ئــەڵێ: «فَإِنَّ الْإِمَامَ أَحْمَد -مَثَلًا- قَدْ بَاشَرَ «الْجَهْمِيَّة» الَّذِينَ دَعَوْهُ إلَى خَلْقِ الْقُرْآنِ وَنَفْيِ الصِّفَاتِ وَامْتَحَنُوهُ وَسَائِر عُلَمَاءِ وَقْتِهِ وَفَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ الَّذِينَ لَمْ يُوَافِقُوهُمْ عَلَى التَّجَهُّمِ بِالضَّرْبِ وَالْحَبْسِ وَالْقَتْلِ وَالْعَزْلِ عَنْ الْوِلَايَاتِ وَقَطْعِ الْأَرْزَاقِ وَرَدِّ الشَّهَادَةِ وَتَرْكِ تَخْلِيصِهِمْ مِنْ أَيْدِي الْعَدُوِّ بِحَيْثُ كَانَ كَثِيرٌ مِنْ أُولِي الْأَمْرِ إذْ ذَاكَ مِنْ الْجَهْمِيَّة مِنْ الْوُلَاةِ وَالْقُضَاةِ وَغَيْرِهِمْ؛ يُكَفِّرُونَ كُلَّ مَنْ لَمْ يَكُنْ جهميًا مُوَافِقًا لَهُمْ عَلَى نَفْيِ الصِّفَاتِ، مِثْلِ: الْقَوْلِ بِخَلْقِ الْقُرْآنِ، وَيَحْكُمُونَ فِيهِ بِحُكْمِهِمْ فِي الْكَافِرِ، فَلَا يُوَلُّونَهُ وِلَايَةً، وَلَا يُفْتِكُونَهُ مِنْ عَدُوٍّ، وَلَا يُعْطُونَهُ شَيْئًا مِنْ بَيْتِ الْمَالِ، وَلَا يَقْبَلُونَ لَهُ شَهَادَةً، وَلَا فُتْيَا، وَلَا رِوَايَةً، وَيَمْتَحِنُونَ النَّاسَ عِنْدَ الْوِلَايَةِ وَالشَّهَادَةِ وَالِافْتِكَاكِ مِنْ الْأَسْرِ وَغَيْرِ ذَلِكَ، فَمَنْ أَقَرَّ بِخَلْقِ الْقُرْآنِ حَكَمُوا لَهُ بِالْإِيمَانِ، وَمَنْ لَمْ يُقِرَّ بِهِ لَمْ يَحْكُمُوا لَهُ بِحُكْمِ أَهْلِ الْإِيمَانِ، وَمَنْ كَانَ دَاعِيًا إلَى غَيْرِ التَّجَهُّمِ قَتَلُوهُ أَوْ ضَرَبُوهُ وَحَبَسُوهُ.

وَمَعْلُومٌ أَنَّ هَذَا مِنْ أَغْلَظِ التَّجَهُّمِ فَإِنَّ الدُّعَاءَ إلَى الْمَقَالَةِ أَعْظَمُ مِنْ قَوْلِهَا وَإِثَابَةُ قَائِلِهَا وَعُقُوبَةَ تَارِكِهَا أَعْظَمُ مِنْ مُجَرَّدِ الدُّعَاءِ إلَيْهَا وَالْعُقُوبَةُ بِالْقَتْلِ لِقَائِلِهَا أَعْظَمُ مِنْ الْعُقُوبَةِ بِالضَّرْبِ. ثُمَّ إنَّ الْإِمَامَ أَحْمَد دَعَا لِلْخَلِيفَةِ

وَغَيْرِهِ مِمَّنْ ضَرَبَهُ وَحَبَسَهُ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ وحللهم مِمَّا فَعَلُوهُ بِهِ مِنْ الظُّلْمِ وَالدُّعَاءِ إلَى الْقَوْلِ الَّذِي هُوَ كُفْرٌ، وَلَوْ كَانُوا مُرْتَدِّينَ عَنْ الْإِسْلَامِ لَمْ يَجُزْ الِاسْتِغْفَارُ لَهُمْ؛ فَإِنَّ الِاسْتِغْفَارَ لِلْكُفَّارِ لَا يَجُوزُ بِالْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ وَالْإِجْمَاعِ، وَهَذِهِ الْأَقْوَالُ وَالْأَعْمَالُ مِنْهُ وَمِنْ غَيْرِهِ مِنْ الْأَئِمَّةِ صَرِيحَةٌ فِي أَنَّهُمْ لَمْ يُكَفِّرُوا الْمُعَيَّنِينَ مِنْ الْجَهْمِيَّةِ».

ئەفەرموێ: «.. کەچی پێشەوا ئەحمەد دوعای خێری کرد بۆ خەلیفە وبۆ ئەوانی تریش کرد کە لێیاندا وخستیانە زیندان وداوای لێخۆشبونی بۆ کردن وگەردنی ئازاد کردن لەو ستەم وبانگەوازکردنە بۆ مەخلوقیەتی قورئان، خۆ ئەگەر مورتەد بوایەن؛ دروست نەبو داوای لێخۆشبونیان بۆ بکات بە قورئان وسوننەت وئیجماع، وئەم وتە وکردە وهەڵوێستانەی ئەحمەد وجگە لەویش لە پێشەوایان زۆر ڕاشکاوە لەسەر ئەوەی ئەوان بە تاك تاکی جەهمیەکانیان تەکفیر نەکردوە».

هەروەها باسێکی دید وتێڕوانینی ئەهلی سوننەت وجەماعەت دەکات بۆ پرسی خیلاف وئەهلی خیلاف، کە لای ئەوان بونیادنراوە لەسەر دادگەری وبەزەیی ولێبوردەیی ونەرمی، وجێبەجێکردنی حوکمی خوا وپەیامبەر لە ئاستیان دور لە حوکمی هەوەس وئارەزو ومەزهەبچێتی وتایەفگەری، کە ئەم شتانە زۆرێك لەوانی وا لێکردوە ستەم ودەستدرێژی بکەنە سەر نەیار

ودژبیرەکەی خۆیان، وەك ئەفەرموێ[1]: «بێگومان تاوان نــە ئەبێتــە مایــەی کافربونی بکەرەکەی وەك خــەوارج ئــەیڵێن، ونــە ئەبێتــە مایــەی مانــەوەی

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٥/٢٣٩ - ٢٤٩). ولەبەر گرنگی، دەقەکە هەموی دەهێنم ولە پەراوێزە دایدەنێین: «وَهَكَذَا الرَّدُّ عَلَى أَهْلِ الْبِدَعِ مِنَ الرَّافِضَةِ وَغَيْرِهِمْ: إِنْ لَمْ يَقْصِدْ فِيهِ بَيَانَ الْحَقِّ وَهُدَى الْخَلْقِ وَرَحْمَتَهُمْ وَالْإِحْسَانَ إِلَيْهِمْ، لَمْ يَكُنْ عَمَلُهُ صَالِحًا... وَهَذَا مَبْنِيٌّ عَلَى مَسْأَلَتَيْنِ:

إِحْدَاهُمَا: أَنَّ الذَّنْبَ لَا يُوجِبُ كُفْرَ صَاحِبِهِ، كَمَا تَقُولُهُ الْخَوَارِجُ، بَلْ وَلَا تَخْلِيدَهُ فِي النَّارِ وَمَنْعَ الشَّفَاعَةِ فِيهِ، كَمَا يَقُولُهُ الْمُعْتَزِلَةُ.

الثَّانِي: أَنَّ الْمُتَأَوِّلَ الَّذِي قَصْدُهُ مُتَابَعَةُ الرَّسُولِ لَا يَكْفُرُ، بَلْ وَلَا يَفْسُقُ إِذَا اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ، وَهَذَا مَشْهُورٌ عِنْدَ النَّاسِ فِي الْمَسَائِلِ الْعَمَلِيَّةِ، وَأَمَّا مَسَائِلُ الْعَقَائِدِ فَكَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ كَفَّرَ الْمُخْطِئِينَ فِيهَا.

وَهَذَا الْقَوْلُ لَا يُعْرَفُ عَنْ أَحَدٍ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ لَهُمْ بِإِحْسَانٍ، وَلَا عَنْ أَحَدٍ مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّمَا هُوَ فِي الْأَصْلِ مِنْ أَقْوَالِ أَهْلِ الْبِدَعِ، الَّذِينَ يَبْتَدِعُونَ بِدْعَةً وَيُكَفِّرُونَ مَنْ خَالَفَهُمْ، كَالْخَوَارِجِ وَالْمُعْتَزِلَةِ وَالْجَهْمِيَّةِ، وَوَقَعَ ذَلِكَ فِي كَثِيرٍ مِنْ أَتْبَاعِ الْأَئِمَّةِ، كَبَعْضِ أَصْحَابِ مَالِكٍ وَالشَّافِعِيِّ وَأَحْمَدَ وَغَيْرِهِمْ.

وَقَدْ يَسْلُكُونَ فِي التَّكْفِيرِ ذَلِكَ؛ فَمِنْهُمْ مَنْ يُكَفِّرُ أَهْلَ الْبِدَعِ مُطْلَقًا، ثُمَّ يَجْعَلُ كُلَّ مَنْ خَرَجَ عَمَّا هُوَ عَلَيْهِ مِنْ أَهْلِ الْبِدَعِ، وَهَذَا بِعَيْنِهِ قَوْلُ الْخَوَارِجِ وَالْمُعْتَزِلَةِ الْجَهْمِيَّةِ، وَهَذَا الْقَوْلُ أَيْضًا يُوجَدُ فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِ الْأَئِمَّةِ الْأَرْبَعَةِ، وَلَيْسَ هُوَ قَوْلُ الْأَئِمَّةِ الْأَرْبَعَةِ وَلَا غَيْرِهِمْ، وَلَيْسَ فِيهِمْ مَنْ كَفَّرَ كُلَّ مُبْتَدِعٍ، بَلِ الْمَنْقُولَاتُ الصَّرِيحَةُ عَنْهُمْ تُنَاقِضُ ذَلِكَ، وَلَكِنْ قَدْ يُنْقَلُ عَنْ أَحَدِهِمْ أَنَّهُ كَفَّرَ مَنْ قَالَ بَعْضَ الْأَقْوَالِ، وَيَكُونُ مَقْصُودُهُ أَنَّ هَذَا الْقَوْلَ كُفْرٌ لِيُحَذِّرَ، وَلَا يَلْزَمُ إِذَا كَانَ الْقَوْلُ كُفْرًا أَنْ يَكْفُرَ كُلُّ مَنْ قَالَهُ مَعَ الْجَهْلِ وَالتَّأْوِيلِ؛ فَإِنَّ ثُبُوتَ الْكُفْرِ فِي حَقِّ الشَّخْصِ الْمُعَيَّنِ، كَثُبُوتِ الْوَعِيدِ فِي الْآخِرَةِ فِي حَقِّهِ، وَذَلِكَ لَهُ شُرُوطٌ وَمَوَانِعُ، كَمَا بَسَطْنَاهُ فِي مَوْضِعِهِ، وَإِذَا لَمْ يَكُونُوا فِي

نَفْسِ الْأَمْرِ كُفَّارًا لَمْ يَكُونُوا مُنَافِقِينَ، فَيَكُونُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَيَسْتَغْفِرُ لَهُمْ وَيَتَرَحَّمُ عَلَيْهِمْ. وَإِذَا قَالَ الْمُؤْمِنُ: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ﴾ [الْحَشْر:١٠] يَقْصِدُ كُلَّ مَنْ سَبَقَهُ مِنْ قُرُونِ الْأُمَّةِ بِالْإِيمَانِ، وَإِنْ كَانَ قَدْ أَخْطَأَ فِي تَأْوِيلٍ تَأَوَّلَهُ فَخَالَفَ السُّنَّةَ، أَوْ أَذْنَبَ ذَنْبًا، فَإِنَّهُ مِنْ إِخْوَانِهِ الَّذِينَ سَبَقُوهُ بِالْإِيمَانِ، فَيَدْخُلُ فِي الْعُمُومِ، وَإِنْ كَانَ مِنَ الثِّنْتَيْنِ وَالسَبْعِينَ فِرْقَةً، فَإِنَّهُ مَا مِنْ فِرْقَةٍ إِلَّا وَفِيهَا خَلْقٌ كَثِيرٌ لَيْسُوا كُفَّارًا، بَلْ مُؤْمِنِينَ فِيهِمْ ضَلَالٌ وَذَنْبٌ يَسْتَحِقُّونَ بِهِ الْوَعِيدَ، كَمَا يَسْتَحِقُّهُ عُصَاةُ الْمُؤْمِنِينَ.

وَالنَّبِيُّ ﷺ لَمْ يُخْرِجْهُمْ مِنَ الْإِسْلَامِ، بَلْ جَعَلَهُمْ مِنْ أُمَّتِهِ، وَلَمْ يَقُلْ: إِنَّهُمْ يَخْلُدُونَ فِي النَّارِ. فَهَذَا أَصْلٌ عَظِيمٌ يَنْبَغِي مُرَاعَاتُهُ ؛ فَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ الْمُنْتَسِبِينَ إِلَى السُّنَّةِ فِيهِمْ بِدْعَةٌ، مِنْ جِنْسِ بِدَعِ الرَّافِضَةِ وَالْخَوَارِجِ.

وَأَصْحَابُ الرَّسُولِ ﷺ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ وَغَيْرُهُ لَمْ يُكَفِّرُوا الْخَوَارِجَ الَّذِينَ قَاتَلُوهُمْ، بَلْ أَوَّلُ مَا خَرَجُوا عَلَيْهِ وَتَحَيَّزُوا بِحَرُوراءَ، وَخَرَجُوا عَنِ الطَّاعَةِ وَالْجَمَاعَةِ، قَالَ لَهُمْ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: إِنَّ لَكُمْ عَلَيْنَا أَنْ لَا نَمْنَعَكُمْ مَسَاجِدَنَا وَلَا حَقَّكُمْ مِنَ الْفَيْءِ. ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيْهِمُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَنَاظَرَهُمْ فَرَجَعَ نَحْوُ نِصْفِهِمْ، ثُمَّ قَاتَلَ الْبَاقِيَ وَغَلَبَهُمْ، وَمَعَ هَذَا لَمْ يَسْبِ لَهُمْ ذُرِّيَّةً، وَلَا غَنِمَ لَهُمْ مَالًا، وَلَا سَارَ فِيهِمْ سِيرَةَ الصَّحَابَةِ فِي الْمُرْتَدِّينَ، كَمُسَيْلِمَةَ الْكَذَّابِ وَأَمْثَالِهِ، بَلْ كَانَتْ سِيرَةُ عَلِيٍّ وَالصَّحَابَةِ فِي الْخَوَارِجِ مُخَالِفَةً لِسِيرَةِ الصَّحَابَةِ فِي أَهْلِ الرِّدَّةِ، وَلَمْ يُنْكِرْ أَحَدٌ عَلَى عَلِيٍّ ذَلِكَ، فَعُلِمَ اتِّفَاقُ الصَّحَابَةِ عَلَى أَنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا مُرْتَدِّينَ عَنْ دِينِ الْإِسْلَامِ ... وَهَذَا بِخِلَافِ مَا كَانَ يَقُولُهُ بَعْضُ النَّاسِ، كَأَبِي إِسْحَاقَ الْإِسْفَرَايِينِيِّ وَمَنِ اتَّبَعَهُ، يَقُولُونَ: «لَا نُكَفِّرُ إِلَّا مَنْ يَكْفُرُ»، فَإِنَّ الْكُفْرَ لَيْسَ حَقًّا لَهُمْ، بَلْ هُوَ حَقٌّ لِلَّهِ، وَلَيْسَ لِلْإِنْسَانِ أَنْ يَكْذِبَ عَلَى مَنْ يَكْذِبُ عَلَيْهِ، وَلَا يَفْعَلُ الْفَاحِشَةَ بِأَهْلِ مَنْ فَعَلَ الْفَاحِشَةَ بِأَهْلِهِ، بَلْ وَلَو اسْتَكْرَهَهُ رَجُلٌ عَلَى اللِّوَاطَةِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ أَنْ يَسْتَكْرِهَهُ عَلَى ذَلِكَ، وَلَوْ قَتَلَهُ بِتَجْرِيعِ خَمْرٍ أَوْ تَلَوَّطَ بِهِ لَمْ يَجُزْ قَتْلُهُ بِمِثْلِ ذَلِكَ، لِأَنَّ هَذَا حَرَامٌ لِحَقِّ اللَّهِ تَعَالَى، وَلَوْ سَبَّ النَّصَارَى نَبِيَّنَا، لَمْ يَكُنْ لَنَا أَنَّ نَسُبَّ الْمَسِيحَ. وَالرَّافِضَةُ إِذَا كَفَّرُوا أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَلَيْسَ لَنَا أَنْ نُكَفِّرَ عَلِيًّا...

هەمیشەیی وڕێگر لە شـەفاعەت بـۆ کردنـی وەك موعتەزیلـەکان ئـەیڵێن.
هەروەها تەئویلکەر کە مەبەستی شوێنکەوتنی پەیامبەرە ﷺ کافر ناکرێت،
بەڵکو فاسقیش ناکرێت ئەگەر کۆشش بکات بـەڵام هەڵـە بکـات، ئەمـەش

---

وَمِمَّا يَدُلُّ عَلَى أَنَّ الصَّحَابَةَ لَمْ يُكَفِّرُوا الْخَوَارِجَ أَنَّهُمْ كَانُوا يُصَلُّونَ خَلْفَهُمْ، وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنه وَغَيْرُهُ مِنَ الصَّحَابَةِ يُصَلُّونَ خَلَفَ نَجْدَةَ الْحَرُورِيِّ، وَكَانُوا أَيْضًا يُحَدِّثُونَهُمْ وَيُفْتُونَهُمْ وَيُخَاطِبُونَهُمْ، كَمَا يُخَاطِبُ الْمُسْلِمُ الْمُسْلِمَ، كَمَا كَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ يُجِيبُ نَجْدَةَ الْحَرُورِيَّ لَمَّا أَرْسَلَ إِلَيْهِ يَسْأَلُهُ عَنْ مَسَائِلَ، وَحَدِيثُهُ فِي الْبُخَارِيِّ. وَكَمَا أَجَابَ نَافِعُ بْنُ الْأَزْرَقِ عَنْ مَسَائِلَ مَشْهُورَةٍ، وَكَانَ نَافِعٌ يُنَاظِرُهُ فِي أَشْيَاءَ بِالْقُرْآنِ، كَمَا يَتَنَاظَرُ الْمُسْلِمَانِ.

وَمَا زَالَتْ سِيرَةُ الْمُسْلِمِينَ عَلَى هَذَا، مَا جَعَلُوهُمْ مُرْتَدِّينَ وَمَعَ هَذَا فَالصَّحَابَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَالتَّابِعُونَ لَهُمْ بِإِحْسَانٍ لَمْ يُكَفِّرُوهُمْ، وَلَا جَعَلُوهُمْ مُرْتَدِّينَ، وَلَا اعْتَدَوْا عَلَيْهِمْ بِقَوْلٍ وَلَا فِعْلٍ، بَلِ اتَّقَوُا اللَّهَ فِيهِمْ، وَسَارُوا فِيهِمُ السِّيرَةَ الْعَادِلَةَ. وَهَكَذَا سَائِرُ فِرَقِ أَهْلِ الْبِدَعِ وَالْأَهْوَاءِ مِنَ الشِّيعَةِ وَالْمُعْتَزِلَةِ وَغَيْرِهِمْ، فَمَنْ كَفَّرَ الثِّنْتَيْنِ وَالسَبْعِينَ فِرْقَةً كُلَّهُمْ فَقَدْ خَالَفَ الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ وَإِجْمَاعَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ لَهُمْ بِإِحْسَانٍ، مَعَ أَنَّ حَدِيثَ الثِّنْتَيْنِ وَالسَبْعِينَ فِرْقَةً لَيْسَ فِي الصَّحِيحَيْنِ، وَقَدْ ضَعَّفَهُ ابْنُ حَزْمٍ وَغَيْرُهُ لَكِنْ حَسَّنَهُ غَيْرُهُ أَوْ صَحَّحَهُ، كَمَا صَحَّحَهُ الْحَاكِمُ وَغَيْرُهُ، وَقَدْ رَوَاهُ أَهْلُ السُّنَنِ، وَرُوِيَ مِنْ طُرُقٍ، وَلَيْسَ قَوْلُهُ: «ثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ وَوَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ» بِأَعْظَمَ مِنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾ [النِّسَاءِ:١٠] وَقَوْلِهِ: ﴿وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ عُدْوَانًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا﴾ [النِّسَاءِ:٣٠]، وَأَمْثَالُ ذَلِكَ مِنَ النُّصُوصِ الصَّرِيحَةِ بِدُخُولِ مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ النَّارَ» اهـ باختصار.

بەناوبانگە لەناو خەڵك لە پرسە فیقهیەکان، بەڵام لــە پرســە بیروباوەڕیــەکان زۆربەی خەڵك ئەوەی تێیدا هەڵە بکات تەکفیریان کردوە.

وقسەی وا نە لە کەس لە هاوەڵان وشوێنکەوتوە چاکەکانیان زانراوە، نــە لە هیچ کــام لــە پێشــەوایانی ئیســلام، بــەڵکو لــە بنەڕەتــدا ئەمــە وتــەی بیدعەچیەکانە، ئەوانەی ئەڕۆن بیدعەیەك دادەهێنن وهەرکــەس پیچــەوانەی بکات تەکفیری دەکەن، وەکو خەوارج وموعتەزیلە وجەهمیەکان، وشتی واش وەشایەوە لە زۆرێك لە شوێنکەوتوانی پێشەواکان وەك شوێنکەوتوانی مالــك وشافعی وئەحمەد وجگە لەوانیش، هەیانە بــە ڕەهــایی بیدعەچــیەکانی پــێ کافرە، ئینجا هەرکەس لەوە دەرچێت ئەو دایناوە کــافری دەکــات، ئەمــەش خودی وتەی خەوارج وموعتەزیلە وجەهمیەکانە .. بەڵێ لــە شــوێنکەوتوانی مەزهەبەکانیشەوە هەیانە بەم شێوەیەن بەڵام هەرگیز شــتی وا وتــەی خــودی چوار پێشەواکە وجگە لەوانیش نیە، هیچ کامیان هــەمو بیدعەچــیەکی پــێ کافر نەبوە، بەڵکو ئەو وتانەی لێوەیــان دەگێڕدرێتــەوە دژی ئەمەیــە... جــا ئەگەر لە خودی خۆیدا کافر نــەبن مونــافقیش نــین، کەواتــە ئیمانــدارن دەی داوای لێخۆشبونیان بۆ دەکرێت وڕەحمەتیان بۆ دەنێردرێت.

کە ئیمانداریش وتی: ﴿پەروەردگارمان لە ئێمە وبراکانمان ببــورە کــە بــە ئیمانەوە مردون﴾ مەبەستی هەمو ئەوانەیە لە ســەدەکانی ئــەم ئوممەتــە بــە ئیمانەوە مردبێتن، بــا هەڵەشــیان کردبێــت لــە تــەئویلێکردنێك پێچــەوانەی سوننەت بوبێت، یان تاوانێکی کردبێت، هەر لەو برایانەیەتی کە بە ئیمانەوە

مردون، وئەو لەفزە گشتیە دەیگرێتەوە، بـا لـە حـەفتا ودو گروپەکـە بێـت، چونکە هەمو فیرقەکان خەڵکێکی زۆریان تێدایە کافر نین، بـەڵکو ئیمانـدارن گومڕایی وتاوانیان تێدایە کە بە هۆیـەوە شایسـتەی هەڕەشـەکانی خـودان، هەروەك تاوانبارانی ئیمانداران.

وپەیامبەریش ﷺ لە ئیسلام نەیبردنە دەرەوە، بەڵکو لە ئوممەتی خـۆی هەژماری کردن، ونەیفەرمو: لە ئاگر بۆ هەمیشەیی دەمێننـەوە، جـا ئەمـە بنەمایەکی مەزنە پێویستە ڕەچاو بکرێت، چـونکە زۆرێـك لەوانـەی لەسـەر سـوننەت حسـێب دەکـرێن، بیدعـەیان تێدایـە لـە جـۆری بیدعـەی شـیعە وخەوارج. وهاوەڵانی پەیامبەریش ﷺ وەك عەلی وئـەوانی تـریش خـەوارج کە شەڕیان لەگەڵ کردن بە کافریان دانەنان.. بەڵکو سەرەتا عەلی پێی وتـن: هەقتان لەسەرمانە ڕێگرتان نەبین لە هاتنە مزگەوتەکانمان ولە دەستکەوتیش بێبەشتان نەکەین، .. کە شەڕیشـی لەگـەڵ کـردن" ئافرەتـەکانیانی نـەکردە سـەبایا، وماڵیـانی نـەکردە غەنیمـەت، ومامەڵـەی لەگـەڵ نـەکردن وەك مامەڵەی هاوەڵان لەگەڵ مورتەدەکان، وەك مامەڵەیان لەگەڵ موسـەیلەمەی درۆزن وهاوشێوەکانی.. کەسیش نکوڵی ئەمەی لـە عـەلی نـەکرد. کەواتـە بەمەوە دەزانرێت بە کۆدەنگی هـاوەڵان خـەوارج مورتـەد وکـافر نـەبون. .. وموسڵمان کەس کافر ناکات لەبەر ئەوەی ئەو ئەم کافر دەکات وەك هەنـدێك وا دەڵێن، ئەڵێن: کەس کافر ناکەین مەگەر کەسێك کافرمان بکـات، نـەخێر شتی وا نابێت، چونکە کوفر هەقی ئەوان نیـە، هـەقی خوایـە، بـۆ مرۆڤـی

موسڵمان نیە درۆ بە دەم کەسێکەوە بکات درۆی بە دەمەوە کـردوە چـونکە درۆ حەرامە... وئەگەر گاوەرێك جوێن بە پەیامبەرەکەمان بدات، بۆمان نیە جوێن بە مەسیح بدەین، تەکفیریش ئاوهایە. هەروەها شیعە ئەگەر تـەکفیری ئەبوبەکر وعومەریان کرد، ئەوە بۆمان نیە ئێمەش تەکفیری عەلی بکەین.

وبەڵگەش لەسەر ئەوەی هاوەڵان تەکفیری خەوارجیان نـەکردوە ئەوەیـە: نوێژیان لە پشتەوەکردون، وعەبـدوڵای کـوڕی عومـەر وجگـە لـەوانیش لـە هاوەڵان نوێژیان لە پشـتی نەجـدەی حەروریـەوە دەکـرد، هـەروەها قسـەیان لەگەڵ دەکردن وفەتوایان بـۆ دەدان وگفتوگۆیـان لەگـەڵ دەکـردن، وەك چـۆن موسڵمان لەگەڵ موسڵماندا قسە دەکات، هەروەك چـۆن ئـیبن عـەبباس کـە نەجدەی حەڕوری نامەی بۆ نوسی وپرسیاری هەندێك پرسی لێکـرد وەڵامـی دایەوە وەك لە بوخاریدا هاتوە، هـەروەها وەڵامـی نـافعی کـوڕی ئـەزرەقی دایەوە لە چەندین پرسی بەناوبانگ، ونافعیش لەبارەی چـەندین پرسـەوە بـە قورئان موناقەشەی لەگەڵ دەکرد، وەك چۆن دو موسڵمان موناقەشە دەکـەن، وئیشی موسڵمانانیش هەر لەسەر ئەمـە هـاتوە، نـەیانکردون بـە مورتـەد، لەگەڵ ئەمەشدا هـاوەڵان وشـوێنەکەوتە چـاکەکانیان خـوا لێیـان ڕزای بـێ تەکفیریانیان نەکرد وبە مورتەد لە قەڵەمیانیان نەدان، ودەستدرێژیان نـەکردە سەریان نە بە دەم ونە بە دەست، بەڵکو تەقوای خوایان کرد لە ئاسـتیان وبـە دادگەری ومیانڕەوی مامەڵەیان لەگەڵ کـردن، هـەرواش مامەڵـەیان کـردوە لەگەڵ باقی بیدعەچیەکاندا وەك شیعە وموعتەزیلەکان وئەوانی تـریش، جـا

هەرکەس تەکفیری هەمو حەفتا ودو فیرقەکە بکات، ئەوا پێچەوانەی قورئـان وسوننەت وئیجماعی هاوەڵان وشوێنکەوتوە چاکەکانی کـردوە...» ت.و بـە پوختی.

هەروەها ئەفەرموێ[1]: «وَإِذَا تَرَكَ الْإِمَامُ أَوْ أَهْلُ الْعِلْمِ وَالدِّينِ الصَّلَاةَ عَلَى بَعْضِ الْمُتَظَاهِرِينَ بِبِدْعَةِ أَوْ فُجُورٍ زَجْرًا عَنْهَا لَمْ يَكُنْ ذَلِكَ مُحَرِّمًا لِلصَّلَاةِ عَلَيْهِ وَالِاسْتِغْفَارِ لَهُ بَلْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِيمَنْ كَانَ يَمْتَنِعُ عَنْ الصَّلَاةِ عَلَيْهِ وَهُوَ الْغَالُّ وَقَاتِلُ نَفْسِهِ وَالْمَدِينُ الَّذِي لَا وَفَاءَ لَهُ: «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ» وَرُوِيَ أَنَّهُ كَانَ يَسْتَغْفِرُ لِلرَّجُلِ فِي الْبَاطِنِ وَإِنْ كَانَ فِي الظَّاهِرِ يَدَعُ ذَلِكَ زَجْرًا عَنْ مِثْلِ مَذْهَبِهِ كَمَا رُوِيَ فِي حَدِيثِ مُحَلِّمِ بْنِ جَثَّامَةَ. وَلَيْسَ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ الْمُظْهِرُونَ لِلْإِسْلَامِ إلَّا قِسْمَانِ: مُؤْمِنٌ أَوْ مُنَافِقٌ فَالْمُنَافِقُ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَالْآخَرُ مُؤْمِنٌ ثُمَّ قَدْ يَكُونُ نَاقِصَ الْإِيمَانِ فَلَا يَتَنَاوَلُهُ الِاسْمُ الْمُطْلَقُ وَقَدْ يَكُونُ تَامَّ الْإِيمَانِ وَهَذَا يَأْتِي الْكَلَامُ عَلَيْهِ إنْ شَاءَ اللَّهُ فِي مَسْأَلَةِ الْإِسْلَامِ وَالْإِيمَانِ وَأَسْمَاءِ الْفُسَّاقِ مِنْ أَهْلِ الْمِلَّةِ؛ لَكِنَّ الْمَقْصُودَ هُنَا أَنَّهُ لَا يُجْعَلُ أَحَدٌ بِمُجَرَّدِ ذَنْبٍ يذنبه وَلَا بِبِدْعَةِ ابْتَدَعَهَا - وَلَوْ دَعَا النَّاسَ إلَيْهَا- كَافِرًا فِي الْبَاطِنِ إلَّا إذَا كَانَ مُنَافِقًا. فَأَمَّا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ الْإِيمَانُ بِالرَّسُولِ وَمَا جَاءَ بِهِ وَقَدْ غَلِطَ فِي بَعْضِ مَا تَأَوَّلَهُ مِنْ الْبِدَعِ فَهَذَا لَيْسَ بِكَافِرِ أَصْلًا».

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٢١٧/٧).

واتە: «... **هەرکەسیٚ ئیمان بە پەیامبەری خوا وبـەوەی هێناویـەتی لە دڵیدا هەبیٚ، وهەڵەی کردبیٚت لە هەندێك لەو پرسانەی کە تەئویلیان تێدا کردوە وبیدعەیە، ئەوە ئەسڵەن کافر نیە**».

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر گروپە لاڕێکان

بە پێویستی ئەزانم بڕۆینە سەر پرسـێکی گـرنگ، ئـەویش بریتیـە لـە: هەڵوێستی ئیبن تیمیە بەرامبەر بە گروپە لاڕیٚ وبیدعەچیەکان وەکـو خـوارج وماتوریدی وشیعە وهتد، وپاشانیش گاور وجولەکـە، بـۆ ئـەوەی زیـاتر ڕون ببێتەوە ئیبن تەیمیە ئـەو قسـانەی هـەر فـەتوا نـەبوە بـەڵکو بـە کـردەییش هەڵوێستی هەر وا بوە تا ڕون ببێتەوە کردەوە ووتەی چەند ڕێکی یـەك بـون، چونکە ئیبن تەیمیە لێکۆڵەر بـوە وبـە دوای هەقـەوە بـوە، وئیشـی توێـژەری زانستیش ئەوەیە: ئەبێت خۆ لە هەر شتێکی نازانستی دابڕنێت وحەقیقـەتی دیدوبۆچونەکان بخاتە ڕو بـە پـاك وپیسـیەوە وبـە چـاك وخراپیـەوە وڕاسـت ودرۆیەوە، چونکە توێژەر ئەبێت سیفاتی ئەمانـەت وڕاسـتگۆیی وڕاشـکاوی ودادگەری ومیهرەبانی تێدا بێت ئەگەرنا توێژەرێکی ستەمکارە، بـەڵیٚ ئـیبن تەیمیە زۆر تیژ وبەهێز بوە لـە هێنانـەوەی بەڵگـەدا بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بەرامبەر توندترین تایەفەی دژە ئەهلی سوننەت مونصیف بوە، بەڵگەش بـۆ قسەکانمان:

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر خەوارجەکان

ئەفەرموێ[1]: «وَالْخَوَارِجُ الْمَارِقُونَ الَّذِينَ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِقِتَالِهِمْ قَاتَلَهُمْ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ أَحَدُ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ، وَاتَّفَقَ عَلَى قِتَالِهِمْ أَئِمَّةُ الدِّينِ مِنْ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ، وَلَمْ يُكَفِّرْهُمْ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَغَيْرُهُمَا مِنْ الصَّحَابَةِ، بَلْ جَعَلُوهُمْ مُسْلِمِينَ مَعَ قِتَالِهِمْ، وَلَمْ يُقَاتِلْهُمْ عَلِيٌّ حَتَّى سَفَكُوا الدَّمَ الْحَرَامَ وَأَغَارُوا عَلَى أَمْوَالِ الْمُسْلِمِينَ، فَقَاتَلَهُمْ لِدَفْعِ ظُلْمِهِمْ وَبَغْيِهِمْ لَا لِأَنَّهُمْ كُفَّارٌ.

وَلِهَذَا لَمْ يَسْبِ حَرِيمَهُمْ وَلَمْ يَغْنَمْ أَمْوَالَهُمْ، وَإِذَا كَانَ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ ثَبَتَ ضَلَالُهُمْ بِالنَّصِّ وَالْإِجْمَاعِ لَمْ يُكَفَّرُوا مَعَ أَمْرِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ بِقِتَالِهِمْ، فَكَيْفَ بِالطَّوَائِفِ الْمُخْتَلِفِينَ الَّذِينَ اشْتَبَهَ عَلَيْهِمْ الْحَقُّ فِي مَسَائِلَ غَلِطَ فِيهَا مَنْ هُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ؟ فَلَا يَحِلُّ لِأَحَدِ مِنْ هَذِهِ الطَّوَائِفِ..».

واتە: «وخەوارجە دەرچوەکان کە پەیامبەر ﷺ فەرمان بە کوشتنیان دەکات وپێشەوای بڕواداران عەلی کوڕی ئەبو تالب یەکێك لە خەلیفە ڕاشدیەکان شەڕی لەگەڵ کردن، وهەمو پێشەوایانی دین لە هاوەڵان وشوێنکەوتوانیان ودوای ئەوانیش کۆکبون لەسەر شەڕکردن لەگەڵیان، وعەلی وسەعد وجگە لەوانیش لە هاوەڵان بە کافریان دانەناون، بەڵکو بە موسڵمانیان زانیون سەرباری شەڕ لەگەڵ کردنیش، وعەلیش شەڕی لەگەڵ نەکردن تا خوێنی حەرامیان ڕشت وپەلاماری ماڵ وحاڵی وموسڵمانانیاندا،

(١) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٨٢).

ئەوسا شەڕی لەگەڵ کردن بـۆ پەرچـدانەوەی سـتەم ودەسـتدرێژیەکەیان نـەك لەبەر ئەوەی کافر بون.

هەربۆیە ژنـەکانیانی بەسـەبایا نـەبرد، ماڵەکانیشـیانی بـە غەنیمـەت نەبرد، جا ئەگەر خەڵکانێك گومڕاییان بە دەق وئیجماع جێگیر بو بێ، کـافر نەکرێن، کە خوا وپەیامبەر فەرمانیان کردوە شەڕیان لەگـەڵ بکـرێ، ئـەی چ جای ئەو کۆمەڵ وتایەفە ڕاجیاوازەکانی تر؟! کە حەقیان لا ڕون نەبۆتـەوە لـە پرسانێك خەڵکی لەمان زاناتر هەڵەی تێدا کردوە؟)).

هەروەها ئەفەرموێ[1]: «..وَهَذَا بِخِلَافِ بِدْعَةِ الْخَوَارِجِ؛ فَإِنَّ أَصْلَهَا مَا فَهِمُوهُ مِنْ الْقُرْآنِ فَغَلِطُوا فِي فَهْمِهِ وَمَقْصُودُهُمْ اتِّبَاعُ الْقُرْآنِ بَاطِنًا وَظَاهِرًا لَيْسُوا زَنَادِقَةً». واتە: ((ئەمـەش بـە پێچـەوانەی بیدعـەی خەوارجـەوە" کـە بنچینەی بیدعەکەیان تێگەیشتنێك بو لە قورئانەوە بەڵام هەڵـە تێگەیشـتن، ومەبەستیان شوێنکەوتنی قورئان بو بە ئاشـکرا ونهـێنی، وزنـدیق وبێـدین نەبون)).

هـەروەها ئەفـەرموێ[2]: «بِخِلَافِ قَوْلِ الْخَوَارِجِ، فَإِنَّهُ كَانَ عَنْ جَهْلٍ بِتَأَوُّلِ الْقُرْآنِ، وَغُلُوٍّ فِي تَعْظِيمِ الذُّنُوبِ، وَكَذَلِكَ قَوْلُ الْوَعِيدِيَّةِ وَالْقَدَرِيَّةِ كَانَ عَنْ تَعْظِيمِ الذُّنُوبِ، وَكَذَلِكَ قَوْلُ الْمُرْجِئَةِ كَانَ أَصْلُ مَقْصُودِهِمْ نَفْيُ التَّكْفِيرِ

---

(١) «مجموع الفتاوى» (١٧/٤٤٦).
(٢) «منهاج السنة» (٦/٣٠٢).

عَمَّنْ صَدَّقَ الرُّسُلَ، وَلِهَذَا رُؤُوسُ الْمَذَاهِبِ الَّتِي ابْتَدَعُوهَا لَمْ يَقُلْ أَحَدٌ أَنَّهُمْ زَنَادِقَةٌ مُنَافِقُونَ..».

واتە: «بە پێچەوانەی وتەی خەوارجەکان کە بە هۆی ناحاڵیان بو لە لێکدانەوەی قورئان، وزیادەڕۆییکردن لە بەگەورەڕاگرتنی تاوان، هەروەها بیدعەی قەدەریەکانیش بەهۆی گەورە سەیرکردنی تاوانەوە بو، هەروەها مورجیئەکان بنچینەی مەبەستەکەیان دورخستنەوەی تەکفیر بو لەوانەی پەیامبەرانیان بەڕاست خستبوەوە، هەر بۆیە سەری ئەو بیدعانەی دایان هێنا کەس نەیوتوە زندیق ومونافیقن بەهۆیەوە».

هەروەها ئەڵێ[1]: «وَلَيْسَ فِي أَهْلِ الْأَهْوَاءِ أَصْدَقُ وَلَا أَعْبَدُ مِنَ الْخَوَارِجِ». واتە: «ولە ناو سەرجەم گروپە گومڕاکاندا لە خەوارج ڕاستگۆتر وخواپەرستتریان تێدا نیە».

وپێشتریش چەندین دەقی تر لەبارەی خەوارجەوە خرایە ڕو.

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر قەدەریەکان

ئیبن تەیمیە ئەڵێ[2]: «وَكَذَلِكَ الْقَدَرِيَّةُ أَصْلُ مَقْصُودِهِمْ تَعْظِيمُ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ وَالْوَعْدِ وَالْوَعِيدِ الَّذِي جَاءَتْ بِهِ الرُّسُلَ وَيَتَّبِعُونَ مِنْ الْقُرْآنِ مَا دَلَّ عَلَى ذَلِكَ». واتە: «هەروەها قەدەریەکان بنەمای مەبەستەکەیان بە گەورە

(١) «منهاج السنة» (١٥٧/٥ - ١٥٨).
(٢) «مجموع الفتاوى» (٢٨٢/٣).

ڕاگرتنی فەرمان ونەهی وبەڵێن وهەڕەشەکان بو کە پەیامبەران هێنابویان وشوێنی قورئان دەکەوتن لەوەدا)).

پێشتریش دەقمان هێناوە لەم بارەوە.

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر موعتەزیلەکان

سەرباری ڕەخنەی زۆری ئیبن تەیمیە لە موعتزیلە وسەرانی، بەڵام دەبینی زۆر بە ئینصاف وڕاستگۆیی وداگەرانە لە بارەیانەوە دەوێت، وەك لەبارەی یەکێك لە سەرکردە هەرە گەورەکانیان ئەڵێ[1]: «فَعَمْرُو بْنُ عُبَيْدٍ وَأَمْثَالُهُ لَمْ يَكُنْ أَصْلُ مَقْصُودِهِمْ مُعَانَدَةُ الرَّسُولِ ﷺ». واتە: ((جا عەمری کوڕی عوبەید وهاوشێوەکانی بنەمای مەبەستەکەیان دژایەتی پەیامبەری خوا ﷺ نەبو)).

هەروەها ئەفەرموێ[2]: «كَمَا أَنَّ الْمُعْتَزِلَة لمَّا نَصَرُوا الإسْلامَ في مواطِنَ كَثِيرَة، وَردُّوا عَلى الكُفَّارِ بِحِجَجٍ عَقْلية، لَم يَكُنْ أَصْلُ دِينِهم تكْذيب الرَّسُول، وَرَد أَخباره وَنُصُوصِه..». واتە: ((..موعتەزیلە لە چەندین شوێندا ئیسلامیان سەرخستوە ووەڵامی بێیباوەڕانیان داوەتەوە بە چەندین بەڵگەی عەقڵی، مەبەستی سەرەکیشیان بە درۆخستنەوەی پەیامبەر ﷺ، وڕەدکردنەوەی هەواڵ ودەقەکانی نەبو)).

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٨٢).
(٢) «درء تعارض العقل والنقل» (٧/١٠٦).

وهەروەها -بە ڕەحمەت بێ- سەر زەنشتی ئیبن فۆرەکی ئەشعەری دەکا کە تەکفیری موعتەزیلەی کردوە ودەسەڵاتدارانی لە دژ هانداون، لەو بارەوە ئەفەرموێ(١): «وَكَانَ ابْنُ فورك فِي مُخَاطَبَةِ السُّلْطَانِ قَصَدَ إظْهَارَ مُخَالِفَةِ الكَرَّامِيَة كَمَا قَصَدَ بِنَيْسَابُورَ الْقِيَامَ عَلَى الْمُعْتَزِلَةِ فِي اسْتِتَابَتِهِمْ، وَكَمَا كَفَّرَهُمْ عِنْدَ السُّلْطَانِ، وَمَنْ لَمْ يَعْدِلْ فِي خُصُومِهِ وَمُنَازِعِيهِ وَيَعْذُرْهُمْ بِالْخَطَأِ فِي الِاجْتِهَادِ بَلْ ابْتَدَعَ بِدْعَةً وَعَادَى مَنْ خَالَفَهُ فِيهَا أَوْ كَفَّرَهُ فَإِنَّهُ هُوَ ظَلَمَ نَفْسَهُ.

وَأَهْلُ السُّنَّةِ وَالْعِلْمِ وَالْإِيمَانِ يَعْلَمُونَ الْحَقَّ وَيَرْحَمُونَ الْخَلْقَ؛ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ ﷺ فَلَا يَبْتَدِعُونَ، وَمَنْ اجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ خَطَأً يَعْذُرُهُ فِيهِ الرَّسُولُ ﷺ عَذَرُوهُ. وَأَهْلُ الْبِدَعِ مِثْلُ الْخَوَارِجِ يَبْتَدِعُونَ بِدْعَةً وَيُكَفِّرُونَ مَنْ خَالَفَهُمْ وَيَسْتَحِلُّونَ دَمَهُ. وَهَؤُلَاءِ كُلٌّ مِنْهُمْ يَرُدُّ بِدْعَةَ الْآخَرِينَ وَلَكِنْ هُوَ أَيْضًا مُبْتَدِعٌ فَيَرُدُّ بِدْعَةً بِبِدْعَةِ وَبَاطِلًا بِبَاطِلِ».

واتە: «وئیبن فۆرەك(٢) تەكفیری موعتەزیلەی کرد لەلای دەسەڵاتداران، وهەرکیش دادگەر نەبێت لە ئاست نەیار ودژەکانی وپۆزشیان بۆ نەهێنێتەوە لە هەڵەکردن کردن لە ئیجتهاددا بەڵکو بڕوا بیدعەیەك دابهێنێت وهەرکەسیش پێچەوانەی کرد دژایەتی بکات یان تەکفیری بکات ئەوا بەڕاستی ستەمی لە خۆی کردوە.

وئەهلی سوننەت وزانست وئیمان شارەزان بە هەق وبە ڕەحمیشن بە خەڵك، شوێنی پەیامبەر ﷺ دەکەون وداهێنان ناکەن، جا هەرکەس

---

(١) «مجموع الفتاوى» (١٦/٩٥ - ٩٦).

(٢) بە زەمەی فائەکە وسکونی واوەکە وفەتحەی ڕائەکە، وتراویشە: بە فەتحەی فائەکە.

ئیجتهادی کرد وهەڵەی کرد، هەڵەیەك پەیامبەر ﷺ پۆزشی بـۆ بهێنێتـەوە ئەمانیش پۆزشی بۆ دەهێننەوە)).

هەروەها ئەڵێ[1]: ((موعتەزیلەکان لە ڕافیزە عاقڵتر وزاناتر ودینـدارترن، ودرۆ وخراپەکاری تێیاندا کەمترە لە چاو ئەواندا)).

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر مورجیئەکان

ئەفـەرموێ[2]: ((وَكَذَلِكَ الْإِرْجَاءُ إِنَّمَا أَحْدَثَهُ قَوْمٌ قَصْدُهُمْ جَعْلُ أَهْلِ الْقِبْلَةِ كُلِّهِمْ مُؤْمِنِينَ لَيْسُوا كُفَّارًا قَابَلُوا الْخَوَارِجَ وَالْمُعْتَزِلَةَ فَصَارُوا فِي طَرَفٍ آخَرَ)). واتە: ((هەروەها ئیرجا، خەڵكانێك دایانهێنا بنـەمای مەبەسـتەکەیان ئەوەبو هەمو ئەهلی قیبلە بکەن بە ئیماندار وکافر نین، ئەمەیان لە بەرامبەر خەوارج وموعتەزیلە کرد بەڵام ئەمانیش پەڕیان گرت)).

پێشتریش دەقمان لەم بارەوە خستەڕو.

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر ماتوریدیەکان

دوای ئەوەی باسی ئەشـعەری وماتوریدیـەکان وکۆمـەڵێك لـە سـەرانیان دەکات ئەفـەرموێ[3]: ((ثُمَّ إِنَه ما مِن هَؤُلاء إِلا مَن لَه في الإسلام مَسَاعٍ مَشْكورة، وَحَسَنات مَبْرُورَة، وله في الرد عَلَى كَثير مِن أَهْل الإِلْحَاد والبِدَع، والانْتِصَار لِكَثِير من أَهْلِ السُّنة والدِّين مَا لا يَخْفى على مَن عَرَف أَحْوالهم،

---

(١) ((منهاج السنة)) (١٥٧/٥ - ١٥٨).

(٢) ((مجموع الفتاوى)) (٢٨٢/٣).

(٣) ((درء تعارض العقل والنقل)) (١٠٢/٢ - ١٠٣).

وتَكَلَّم فِيهم بِعِلْم وصِدْق وَعَدْل وإِنصاف، لِكن لما الْتَبَس عليهم هذا لِأَصْلِ المَأْخُوذ ابتداء عن المعتزلة، وهم فضلاء عقلاء احتاجوا إلى طرده والتزام لوازمه، فلزمهم بسبب ذلك من الأقوال ما أنكره المسلمون من أهل العلم والدين، وصار الناس بسبب ذلك: منهم من يعظمهم، لما لهم من المحاسن والفضائل، ومنهم من يذمهم، لما وقع في كلامهم من البدع والباطل، وخيار الأمور أوساطها. وهذا لي مخصوصًا بهؤلاء، بل مثل هذا وقع لطوائف من أهل العلم والدين، والله تعالى يتقبل من جميع عباده المؤمنين الحسنات، ويتجاوز لهم عن السيئات، [ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا بالإيمان ولا تجعل في قلوبنا غلا للذين آمنوا ربنا إنك رؤوف رحيم] [الحشر:١٠] ...» هتد. ولەبەر گرنگی وتە زێڕینەكانی لە بەشەكانی پێشەوە بە درێژی هێنامانەوە.

واتە: «هیچ یەكێك نیە لەمانە مەگەر هەوڵ وتێكۆشانیان هەیە لە پێناوی ئیسلام كە سوپاس دەكرێن لەسەری، وكۆمەڵێ چاكەیان هەیە، وكۆمەڵێ هەوڵ وماندوبونیان هەیە لە وەڵامدانەوەی مولحید وبیدعەچیەكان، وسەرخستنی زۆرێكی ئەهلی سوننەت ودین، كە هەركەس شارەزای حاڵ وباریان بێت، وبە زانست وڕاستگۆیی ودادگەری وئینصافەوە قسەی لەبارەوە كردبێتن ئەم شتانەی لا شاراوە نیە».

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر ئەشعەریەکان

ئەو دەقەی پێشوش هەر لەبارەی ئەشعەریەکانەوە بو لەگەڵ ماتروديەكان. هەروەها ئەڵێ[1]: «..وإِنْ كَان في كلامِهم مِن الأَدِلَّة الصَّحيحة ومُوافَقةِ السنة ما لا يُوجَد في كَلام عَامَّة الطَّوائف فإنهم أَقربُ طَوائِف أهلِ الكلام إلى السَّنة والجماعة والحديث، وهم يُعَدّون من أهل السنة والجماعة عند النظر إلى مثل المعتزلة والرافضة ونحوهم بل هم أهل السنة والجماعة في البلاد التي يكون أهل البدع فيها المعتزلة والرافضة ونحوهم».

واتە: «.. ئەگەرچی لە قسەکانیاندا ئەوەندە بەڵگەی ڕاست وڕێکی سوننەت هەیە کە لە وتەی زۆربەی تایەفەکانی تردا نیە، بۆیە ئەوان [واتە: ئەشعەریەکان] نزیکترین تایەفەکانی ئەهلی کەلامن لە ئەهلی سوننەت وجەماعەت وحەدیسەوە، وئەمان بە ئەهلی سوننە وجەماعە هەژمار دەکرێن لە چاو شیعە وموعتەزیلە وهاوشێوەکانیان، بەڵکو ئەوان خودی ئەهلی سوننە وجەماعەتن لەو شوێنانەی کەوا بیدعەچیەکانی تێدا نیشتەجێ وبالادەستن وەك موعتەزیلە وشیعە وهاوشێوەکانیان».

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر بە شیعەکان

سەرباری جیاوازی زۆری بیرو دیدوبۆچون، بەڵام دەبینی زۆر بە ئینصاف وڕاستگۆیی وداگەرانە لە بارەیانەوە دەدوێت، وەك لەبارەی شیعەی

(١) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٨٢).

جەعفەریە ئیمامیەکانەوە -کە زۆربەی شیعەکانی جیهانن- ئەفەرموێ[1]: «..مَعَ أَنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ لَيْسُوا مُنَافِقِينَ وَلَا كُفَّارًا، بَلْ بَعْضُهُمْ لَهُ إِيمَانٌ وَعَمَلٌ صَالِحٌ، وَمِنْهُمْ مَنْ هُوَ مُخْطِئٌ يُغْفَرُ لَهُ خَطَايَاهُ، وَمِنْهُمْ مَنْ هُوَ صَاحِبُ ذَنْبٍ يُرْجَى لَهُ مَغْفِرَةُ اللَّهِ..». واتە: «لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێکیان مونافیق نین وکافریش نین، بەڵکو ئیمان وکردەوەی چاکەی هەیە، هەشیانە هەڵەیە خوا لە هەڵەکەی دەبورێت، هەشیانە تاوانبارە ئومێد دەکرێت خوا لێی ببورێت».

هەروەها ئەڵێ[2]: «وَهَذَا بِخِلَافِ بِدْعَةِ الْخَوَارِجِ؛ فَإِنَّ أَصْلَهَا مَا فَهِمُوهُ مِنْ الْقُرْآنِ فَغَلِطُوا فِي فَهْمِهِ وَمَقْصُودُهُمْ اتِّبَاعُ الْقُرْآنِ بَاطِنًا وَظَاهِرًا لَيْسُوا زَنَادِقَةً. وَكَذَلِكَ الْقَدَرِيَّةُ أَصْلُ مَقْصُودِهِمْ تَعْظِيمُ الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ وَالْوَعْدِ وَالْوَعِيدِ الَّذِي جَاءَتْ بِهِ الرُّسُلَ وَيَتَّبِعُونَ مِنْ الْقُرْآنِ مَا دَلَّ عَلَى ذَلِكَ. فَعَمْرُو بْنُ عُبَيْدٍ وَأَمْثَالُهُ لَمْ يَكُنْ أَصْلُ مَقْصُودِهِمْ مُعَانَدَةُ الرَّسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَالَّذِي ابْتَدَعَ الرَّفْضَ. وَكَذَلِكَ الْإِرْجَاءُ إنَّمَا أَحْدَثَهُ قَوْمٌ قَصْدُهُمْ جَعْلُ أَهْلِ الْقِبْلَةِ كُلِّهِمْ مُؤْمِنِينَ لَيْسُوا كُفَّارًا قَابَلُوا الْخَوَارِجَ وَالْمُعْتَزِلَةَ فَصَارُوا فِي طَرَفٍ آخَرَ.

وَكَذَلِكَ التَّشَيُّع الْمُتَوَسِّطُ الَّذِي مَضْمُونُهُ تَفْضِيلُ عَلِيٍّ وَتَقْدِيمُهُ عَلَى غَيْرِهِ وَنَحْوَ ذَلِكَ لَمْ يَكُنْ هَذَا مِنْ إحْدَاثِ الزَّنَادِقَةِ بِخِلَافِ دَعْوَى النَّصِّ فِيهِ وَالْعِصْمَةِ فَإِنَّ الَّذِي ابْتَدَعَ ذَلِكَ كَانَ مُنَافِقًا زِنْدِيقًا». واتە: «.. بە هەمان شێوە شیعەگەرێتی مامناوەند کە ناوەڕۆکەکەی بریتیە لە فەزڵدانی عەلی

(١) «منهاج السنة» (٦/٣٠٢).

(٢) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٨٢).

وپێشخستنی بەسەر جگە لەوی، وهاوشێوەی ئەم بۆچونانە زیندیقەکان دایان نەهێنا [واتە: بنەمای مەبەستەکەیان خۆشویستنی عەلی بوە]..».

هەروەها وتەیەکی زۆر جوانی هەیە لەسەر شیعەکان کە بەڵگەی ئینسافی ئەو پیاوە بەڕێزەیە، ئەڵێ[1]: «.. وَيَنْبَغِي أَيْضًا أَنْ يُعْلَمَ أَنَّهُ لَيْسَ كُلُّ مَا أَنْكَرَهُ بَعْضُ النَّاسِ عَلَيْهِمْ يَكُونُ بَاطِلًا، بَلْ مِنْ أَقْوَالِهِمْ أَقْوَالٌ خَالَفَهُمْ فِيهَا بَعْضُ أَهْلِ السُّنَّةِ، وَوَافَقَهُمْ بَعْضٌ، وَالصَّوَابُ مَعَ مَنْ وَافَقَهُمْ لَكِنْ لَيْسَ لَهُمْ مَسْأَلَةٌ انْفَرَدُوا بِهَا أَصَابُوا فِيهَا، فَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعُدُّ مِنْ بِدَعِهِمُ الْجَهْرَ بِالْبَسْمَلَةِ، وَتَرْكَ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ إِمَّا مُطْلَقًا، وَإِمَّا فِي الْحَضَرِ، وَالْقُنُوتَ فِي الْفَجْرِ، وَمُتْعَةَ الْحَجِّ، وَمَنْعَ لُزُومِ الطَّلَاقِ الْبِدْعِيِّ، وَتَسْطِيحَ الْقُبُورِ، وَإِسْبَالَ الْيَدَيْنِ فِي الصَّلَاةِ، وَنَحْوَ ذَلِكَ مِنَ الْمَسَائِلِ الَّتِي تَنَازَعَ فِيهَا عُلَمَاءُ السُّنَّةِ، وَقَدْ يَكُونُ الصَّوَابُ فِيهَا الْقَوْلَ الَّذِي يُوَافِقُهُمْ، كَمَا يَكُونُ الصَّوَابُ هُوَ الْقَوْلَ الَّذِي يُخَالِفُهُمْ لَكِنَّ الْمَسْأَلَةَ اجْتِهَادِيَّةٌ، فَلَا تُنْكَرُ إِلَّا إِذَا صَارَتْ شِعَارًا لِأَمْرٍ لَا يُسَوَّغُ، فَتَكُونُ دَلِيلًا عَلَى مَا يَجِبُ إِنْكَارُهُ، وَإِنْ كَانَتْ نَفْسُهَا يُسَوَّغُ فِيهَا الِاجْتِهَادُ، وَمِنْ هَذَا. وَضْعُ الْجَرِيدِ عَلَى الْقَبْرِ، فَإِنَّهُ مَنْقُولٌ عَنْ بَعْضِ الصَّحَابَةِ، وَغَيْرُ ذَلِكَ مِنَ الْمَسَائِلِ».

واتە: «هەروەها ئەبێت ئەوەش بزانرێت مەرج نیە هەر شتێك خەڵك ڕەخنەیان لە شیعە دەگرت لەسەری هەڵە بێت، بەڵكو لە قسەکانیان قسەی وایان هەیە هەندێك لە ئەهلی سوننەت هاوڕایان بون وهەندێکیشیان ڕاجیاواز بون، کەچ هەقەکەش لەگەڵ ئەوانەدا بوە کە هاوڕایان بون، بەڵام

---

(١) «منهاج السنة» (١٥٧/٥ - ١٥٨).

هیچ مەسەلەیەکیان نیە خۆیان بە تەنها بڕوایان پێ هەبێت بەبێ هیچ تایەفێکی تر وتێیدا پێکابێتیان».

هەروەها ئەڵێ[(١)]: «..وَالرَّافِضَةُ فِيهِمْ مَنْ هُوَ مُتَعَبِّدٌ مُتَوَرِّعٌ زَاهِدٌ، لَكِنْ لَيْسُوا فِي ذَلِكَ مِثْلَ غَيْرِهِمْ مِنْ أَهْلِ الْأَهْوَاءِ، فَالْمُعْتَزِلَةُ أَعْقَلُ مِنْهُمْ وَأَعْلَمُ وَأَدْيَنُ، وَالْكَذِبُ وَالْفُجُورُ فِيهِمْ أَقَلُّ مِنْهُ فِي الرَّافِضَةِ. وَالزَّيْدِيَّةُ مِنَ الشِّيعَةِ خَيْرٌ مِنْهُمْ: أَقْرَبُ إِلَى الصِّدْقِ وَالْعَدْلِ وِالْعِلْمِ، وَلَيْسَ فِي أَهْلِ الْأَهْوَاءِ أَصْدَقُ وَلَا أَعْبَدُ مِنَ الْخَوَارِجِ».

واتە: «وشیعەکان تێیاندایە کە خواپەرست ودور لە حەرام ودونیا نەویستە».

پاشان ئیبن تەیمیە باسی خاڵێکی زۆر گرنگ دەکات لە ڕەوشتی سەلەفی ساڵەح (ئەهلی سوننەت وجەماعەت) لەگەڵ نەیارەکانیان کە بریتیە لە: بەزەیی ودادگەری ومیهرەبانی ومیانڕەوی وڕاستگۆیی..، بەڵکو لە خۆشیان بە ئینصافترن وەك لەناو خۆیاندا، جا دوای ئەو وتەیەی پێشوی ئەفەرموێ[(٢)]:

«وَمَعَ هَذَا فَأَهْلُ السُّنَّةِ يَسْتَعْمِلُونَ مَعَهُمُ الْعَدْلَ وَالْإِنْصَافَ وَلَا يَظْلِمُونَهُمْ؛ فَإِنَّ الظُّلْمَ حَرَامٌ مُطْلَقًا كَمَا تَقَدَّمَ، بَلْ أَهْلُ السُّنَّةِ لِكُلِّ طَائِفَةٍ مِنْ هَؤُلَاءِ خَيْرٌ مِنْ بَعْضِهِمْ لِبَعْضٍ، بَلْ هُمْ لِلرَّافِضَةِ خَيْرٌ وَأَعْدَلُ مِنْ بَعْضِ الرَّافِضَةِ لِبَعْضٍ، وَهَذَا مِمَّا يَعْتَرِفُونَ هُمْ بِهِ، وَيَقُولُونَ: أَنْتُمْ تُنْصِفُونَنَا مَا لَا يُنْصِفُ بَعْضُنَا بَعْضًا. وَهَذَا لِأَنَّ الْأَصْلَ الَّذِي اشْتَرَكُوا فِيهِ أَصْلٌ فَاسِدٌ مَبْنِيٌّ

---

(١) «منهاج السنة» (١٥٧/٥ - ١٥٨).

(٢) «منهاج السنة» (١٥٧/٥ - ١٥٨).

عَلَى جَهْلٍ وَظُلْمٍ، وَهُمْ مُشْتَرِكُونَ فِي ظُلْمِ سَائِرِ الْمُسْلِمِينَ، فَصَارُوا بِمَنْزِلَةِ قُطَّاعِ الطَّرِيقِ الْمُشْتَرِكِينَ فِي ظُلْمِ النَّاسِ. وَلَا رَيْبَ أَنَّ الْمُسْلِمَ الْعَالِمَ الْعَادِلَ أَعْدَلُ عَلَيْهِمْ وَعَلَى بَعْضِهِمْ مِنْ بَعْضٍ، وَالْخَوَارِجُ تُكَفِّرُ أَهْلَ الْجَمَاعَةِ، .. هتد وتةكاني كة ثيَشتر باسمان كرد».

واته: «لەگەڵ ئەوەشدا ئەهلی سوننەت وجەماعەت لەگەڵیاندا [واتە: شیعە] دادگەر ومونصیفن وستەمیان لێناکەن، چونکە ستەم هەمیشە حەرامە وەك باسمانکرد، بەڵکو ئەهلی سوننەت بۆ هەر یەك لەم تایەفانە باشترن وەك لە خۆیان بۆ خۆیان، ولە خۆیان باشترن بۆ یەکتر، بەڵکو بۆ شیعە باشتر ودادگەرترن لە خودی شیعە لە نێو خۆیان، تەنانەت ئەمە حەقیقەتێکە خۆیان دانی پیدا ئەنێن، ئەڵێن: ئێوە ئینصافتان زیاترە لەگەڵماندا، وەك لە هەنێکمان بەرامبەر بە یەکتر.. بێگومان موسڵمانی زانای دادگەر داگەرترە بۆیان وەك لە هەندێکیان بەرامبەر بە یەکتر».

هەروەها باسی ئەوەش ئەکا کە کۆمەڵێ هەوڵیان هەیە لە بانگەوازکردنی کافرەکان بۆ ئیسلام، وخەڵکێکی زۆر لەسەر دەستیان هاتۆتە نێو ئیسلامەوە(١).

تەنانەت لە «مجموع الفتاوى» باسی ئەوە دەکات ڕێگەی نەداوە سوڵتان ستەم لە دیلە شیعەکان بکات وەك چۆن ئەوان ستەمیان لە دیلی ئەمان کردوە ولە شوێنێکی ئارام دایناون نەوەك کەس تۆڵەیان لێبکاتەوە.

---

(١) «هكذا تحدث ابن تيمية» (ص١٦٦).

# هەڵوێستی کردەیی ئیبن تەیمیە بەرامبەر نەیارەکانی

بێگومان هیچ کەسایەتیەك نیە لە مێژوی ئیسلامدا لەم هەشتسەد ساڵەی دواییدا ستەمی لێکرا بێت بە ئەندازەی کەسایەتی ئیبن تەیمیە، بەڵکو رۆژ لە ڕۆژ زیاتر دەبێت، ووالله گومانم نیە ئەگەر ئەمانە کتێبەکانی ئیبن تەیمیە وژیاننامەیان بخوێندبایەتەوە کە هی ئەون ستەمیان لە ئیبن تەیمیە نەدەکرد -ئەگەر هەقویست بوایەن-، بەڵام زۆر شت دەوترێ وەك «بوتی» وتی: نە بە خەتی خۆی، نە لە وتەی خۆی نەمان بینیوە، بەڵکو وتەی نەیارەکانیەتی، ومرۆڤیش وتەی نەیار لەسەر نەیار وەربگرێت بەبێ گەڕانەوە بۆ بەرامبەر ئەوە ستەمی لەو ولە خۆیشی کردوە.

جا ئەم پیاوە پڕ بوە لە میهرەبانی ودادگەری بەرامبەر نەیارەکانیشی، هەر بۆیە لای هەمویان خۆشەویست بوە.

زەهەبی ئەڵێ[1] -کە ئەڵێن زەهەبی لەبەرەی ئیبن تەیمیەش نەبوە-: «مَعَ مَا اشْتهر مِنْهُ من الْوَرع وَكَمَال الْفِكر وسعة الْإِدْرَاك وَالْخَوْف من الله الْعَظِيم والتعظيم لحرمات الله، فَجرى بَينه وَبينهمْ حَملات حَربية ووَقَعات شَامية ومِصرية، وَكم من نوبَة قد رَمَوْهُ عَن قَوس وَاحِدَة فينجيه الله تَعَالَى، فَإِنَّهُ دَائِم الابتهال كثير الاستغاثة قوي التَّوَكُّل ثَابت الجأش لَهُ أوراد وأذكار يدبجها بكيفية وجمعية، وَله من الطّرف الآخر محبون من الْعلمَاء

(١) «الرد الوافر على من زعم أن من سمى ابن تيمية شيخ الإسلام كافر» (ص٧١).

والصلحاء وَمن الْجند والأمراء وَمن التُّجَّار والكبراء، وَسَائِر الْعَامَّة تحبه لِأَنَّهُ منتصب لنفعهم لَيْلًا وَنَهَارًا بِلِسَانِهِ وقلمه، وَأما شجاعته فبها تضرب الْأَمْثَال وببعضها يتشبه أكَابِر الْأَبْطَال».

واته: «له نێوان ئەو ونەیارەکانیدا چەندین هێرش وپەلامار ڕویداوە لە شام ومیسر، چەند جار لێی کۆ دەبونەوە ودەستیان تێکەڵ دەکرد بەڵام خوای گەورە دەیپاراست، چونکە پیاوێك بو دوعا وپاڕانەوەی زۆر بو، زۆر ئەکڕوزایەوە، زۆر داوای کۆمەکی دەکرد لە خوا، پشتقایم بو بەخوا، زۆر لێهاتو وزیرەك بو، کۆمەڵی ویرد وزیکری هەبو تێکەڵی دەکرد بۆ خۆی دەیخوێند، .. هەروەها خەڵکی عەوام خۆشیان دەویست چونکە خۆی تەرخانکردبو بۆ سودپێگەیاندیان بە شەو وڕۆژ بە زمان وپێنوسەکەی».

ئەوانەشی دژایەتیان کردوە بەڕاستی نەیان زانیوە قسەکانی چیە بۆیە وایان کردوە. تەنانەت ئیبن تەرخانی مەلکاوی لە بارەی دوژمنەکانی ئیبن تەیمیەوە ئەڵێ[1] -کە نەیاری ئیبن تەیمیەش بوە-: «ئەگەر ئەوانیش بیانزانیایە ئەم چی ئەڵێ وقسەکانی چین، ئەوا خۆشویان دەویست».

هەروەها قازی سوبوکی شافعی ئەڵێ[2] -کە نەیاری ئیبن تەیمیەش بوە-: «واللە کەس ڕقی لە ئیبن تەیمیە نیە مەگەر نەزان یان خاوەن ئارەزو

(١) «الرد الوافر» (ص١٤١).

(٢) «الرد الوافر» (ص٩٩).

وهەوەس، جا نەزان نازانێ چی ئەڵێ، وخاوەن هەوا وئـارەزوش هەوەسـەکانی ڕێگری لە هەق لێدەکەن دوای ناسینەوەی)).

جا مەبەست لەوەیە ئیبن تەیمیە ستەمی لێدەکرێ.

هەروەها ئیبن تەیمیە بنەمایەکی مەزن بـۆ لێبـوردەیی دادەنێـت لەمـەڕ مامەڵەکردن لەگەڵ نەیار وحەسودەکاندا، کە لە وتە بەناوبانگەکەیـدا ئـەڵێ: ((أَحْلَلْتُ كُلَّ مُسْلِمٍ عَنْ إِيذائِه لي)). واتە: ((گەردنی هەمو موسڵمانێك ئـازاد بێت هـەر ئـازارێکی مـنی دابێـت)). زۆرجـاریش هەرکـە ئازاریـان دابێـت وبوهتانێکیان بۆ کردبێت دوبارەی کردۆتەوە.

وەکو ئەوەی پێیان بڵێ: من کێشەم لەگەڵ خودی خۆتاندا نیە وناشمـەوێ تۆڵەتان لێبکەمەوە، تەنها مەبەستم سەرخستنی هەق وڕاسـتی ودادگەریـە، حەزم لە خێر وخۆشی وچاکە بۆ هەموتان، ئازاریشم بدەن مـن هـەر دوعـای خێرتان بۆ دەکەم، چونکە هەم خێری وتوە وهـەم خێریشـی ئەنجامـداوە. **بـا ئێسـتاش بڕۆینـە سـەر هەنـدێك نمونـەی لێبـوردەیی ودڵگـەورەیی وسنگفراوانی ئەو لە بەرامبەر نەیارەکانی:**

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر شێخ عەلی یەعقوبی بەکری سۆفی

ئەم کەسـە بەناوبانگـە کـە ئـازاری زۆری ئـیبن تەیمیـەی داوە، وهـەرە سەختترین وبە ئازارترین ئەو نارەحەتیانەی ڕوبەڕوی ئیبن تەیمیە بویەوە بریتی بو لەو بەڵایەی لەگەڵ سۆفیە توندڕەوەکاندا ((غلاة الصوفية)) ڕویدا، جا کە لە

میسر دەرکرا لە زیندان، دەستی کردەوە بە وانە وئامۆژگاریەکانی وجێگیرکردنی بیروباوەڕی سەلەفی سالّح لە دلّی خەلّك وقوتابیەکانیدا، ورەخنەی لەو هەمو خورافیاتانە دەگرت کە لە میسری ئەوکاتە بەربلاو بو، ئەمەش سالّی ٧٠٧، بۆیە خەلّکی پێئەگەیاند وتێئەگەیاند لەسەر بیروباوەڕی پاکی دور لە خورافی وشتی پوچ وبێبنەما.

ئەمە سۆفیە توندڕەوەکانی میسری توڕە کرد، ئەوەبو عەلی بەکری وئیبن عەتاللا سکەندەری ونەسری المنبجی ڕێککەوتن وخەلّکیان کۆکردەوە ودەسەلاتداریان هاندا لە دژ ئیبن تەیمیە تا بکرێتەوە بەندیخانەوە وڕێگەی پێنەدرێ دەرس بداتەوە، فعلەن سەرکەوتوش بون.

بەلاّم ئیبن تەیمیە کۆلّی نەدا، ولە زیندانیش خەلّك سەری لێدەدا وفێری زانست دەبون لێوەی وپرسیاری شەرعیان لێدەکرد وفەتوای بۆ دەدان، هەتا ئەوەبو «جاشنگیر» کە قوتابی المنبجی بو لە قاهیرەوە گواستیەوە ونەفی کرد بۆ ئیسکەندەریە ئەمەش سالّی ٧٠٩ بو.

هۆکاری دژایەتی عەلی بەکریش بۆ شێخی ئیسلام بریتی بو لەوەی ئیبن تەیمیە کتێبێکی نوسی بە ناوی «الإستغاثة» پڕ لە بەلّگەی قورئان وسوننەت وعەقلّ لەسەر نادروستی هاوارکردنە جگە لە خوا، لە وەلاّمی ئەوەی بەکری پێی دروست بو داوای کۆمەك ویارمەتی لە جگە لە خوای گەورە بکرێت.

دەی لە پرسی خیلافی نێوان دو زانا، ئەبێت بەڵگە ودەلیـل قسـە بکـەن نەك لە بری خستنە ڕوی بەڵگە وبەرچاوڕونی، حوکمـەکانی تـەکفیر وتەبـدیع بێنە پێشەوە.

بەلام بەکری وەك شێخی نەکرد، ڕۆیشـت تـەکفیری ئـیبن تەیمیـەی کـرد وتی لە ئیسلام ڕۆیشتۆتە دەرەوە وزندیقە[1]، هـەر بـە مەشـەوە ڕانەوەسـتا ڕۆیشت ئازاری شێخی دەدا بە زمـان وکـردەوە وهـانی دەسـەڵاتدارانی دەدا بیخەنە زیندانەوە یا بیکوژن، تەنانەت لەسەر کتێبەکە ساڵی ٧٠٧ هەنـدێك زانا وتی: با تەمبێ بکرێ، بەڵام ئەو وتـی: نـا ئـەبێت بکـوژرێ[2]، ئـەوەبو ساڵی ٧١١ دوای لێ تـوڕەکردنی سـەربازەکان وپڕکردنـی پیـاوانی دەوڵـەت وئەوەبو خەڵکی کۆکردەوە وخۆیشی لەگەڵیان بە تـەنیا شـێخیان گـیر هێنـا وزۆریان لێدا وجلوبەرگەکانی بەریان دڕی وبەکری بە دەستی خۆی زۆری لێـدا ودەستدرێژی جەستەیی زۆریان کردە سەری، بەڵام شێخ لەوە زیـاتری نـەوت: **حسبنا الله ونعم الوكيل**[3].

---

(١) بڕوانە: «**الإستغاثة**» (٢/٥٩٦).

(٢) بڕوانـە: «**الدرر الكامنة**» (١/١٥٥) هـەروەها: «**الجامع لسيرة شيخ الإسلام**» (ص٦٧٨ - ٦٧٩) .

(٣) بڕوانە: «**الجامع لسيرة شيخ الإسلام**» (ص٦٧٨، و٤٧٨ و٥٠٩).

ئــەوەبو فیتنەیــە گــەورەی لێبویــەوە وژمارەیــەکی زۆر لــە ســەربازانی دەوڵەت وسوارچاکان وخەڵکێکی زۆر لــە دەوری ئــیبن تیمیــە کۆبونــەوە بــۆ تۆڵەکردنەوە.

دەوڵەتیش هاتە سەر خەت، وکەوتنە دوای بەکری، بەڵام خۆی شاردەوە.

وتیان: گەورەم، خەڵکێکی زۆر لە حوســەینیەوە هــاتون، ئەگــەر پێیــان بڵێی: میسر بڕوخێنن، دەیڕوخێنن.

ئەویش وتی: لەبەر چی کاری وائەکەن؟

وتیان: لەبەر تۆ!

وتی: ئەمە حەق نیە.

وتیــان: ئــەڕۆین بــۆ مــاڵی ئەوانــەی ئازاریــان داوی، ئــەیان کــوژین وماڵەکانیان بەسەردا دەڕوخێنین، ئەوان ئەم فیتنەیەیان ناوەتەوە.

وتی: شتی وا حەڵاڵ نیە.

وتیان: ئەی ئەوان لەگەڵ تۆ کردیان حــەڵاڵ بــو؟! بەڕاســتی خۆمــان پــێ ناگیرێ لەسەر شتی وا، هەر ئەبێت بڕۆین ولێیان بدەین لەسەر ئەو کارە.

بەڵام ئەو هەر نکوڵی کرد وڕێگــەی نــەدەدا وپێــی وتــن: «**أنا ما أنتصر لنفسي**» ((من لەبەر نەفسی خۆم تۆڵە لەکەس ناکەمەوە)).

ئیتر هەر هێنایان وبردیان وکپ نەبوەنەوە، ئەوسا فەرموی: ((یــا ئــەوەتا ئەمە حەقی منە، یا حەقی ئێوەیە، یا حەقی خوایــە. **ئەگــەر حــەقی منــە گەردنیان ئازابێ**، ئەگەریش حەقی ئێوەیە وگوێم لێنــاگرن ئــیتر پرسیاریشــم

لێمەکەن، بڕۆن بۆ خۆتان چی ئەکەن بیکەن، ئەگەریش حـەقی خوایـە، ئـەوا خوا حەقی خۆی وەردەگرێت کەی بیەوێ وچۆنی بوێ)).

وتیان: ئەی ئەو کارەی ئەوان کردیان حەڵاڵ بو؟

فەرموی: **ئەو کارەی ئەوان کردیان لەوانەیە خوای گەورە ئەجریشـیان بداتەوە لەسەری!**

وتیان: کەواتە تۆ لەسەر ناهەقی وئەوان لەسەر حەق، مادام تـۆ ئـەڵێی: پاداشت دەرێنەوە، دەی بە قسەیان بکە ووەك ئەوان بکە.

ئەویش وتی: بەو شێوازە نیە ئێوە تێگەیشـتون، لەوانەیـە ئیجتهادیـان کردبێت وهەڵەیان کردبێت، بۆیە ئەمەشیان کردبێت بە ئیجتیهـادی خۆیـان، موجتەهیدێکیش هەڵە بکا، ئەجری دەستدەکەوێت.

ئیتر ئەم قسـانە گەیشـتە نـەیارەکانی، سـەیریان لێهـات، وتیـان: واللّٰه ستەمکار بوین دەرهەق بەم پیاوە کە لێمان دا، واللّٰه ئەوەی ئەم پیاوە ئـەیڵێ حەقە.

ئیتر وەکو وتمان ئەم فیتنە گەورە بو وبەکرییش خۆی شاردەوە، بەڵام لـە کوێ؟ لە ماڵی ئیبن تەیمیە ئارامتری دەست نەکـەوتبو، لـەوێ مایـەوە هـەتا ئیبن تیمیە چو تکای بۆ کرد لای دەسەڵاتداران تا لێی خۆشبن وببورن(١).

---

(١) بڕوانــە: «البداية والنهاية» (١٤/٨٠ - ١٣١). وبڕوانــە: «الجامع لسيرة شيخ الإسلام» (ص٦٧٨ - ٦٧٩).

هەورەكو پێشتر باسمان كرد، ئەمە مەنهەجی هەمیشـەیی ئـیبن تەیمیـە بوە، وەك ئەڵێ[1]: «هەربۆیە لە بەرامبەر ئەو نەفامی ودرۆ هەڵبەسـتنەی بـۆ ئێمە كردی [واتە بەكری سۆفی]، ڕوبەروی نەبوینەوە بە تكفیركردنی وەك ئـەو كردی، وەك چۆن كەسێك شایەتی درۆ بدات لەسـەر كەسـێك یـان بـە درۆوە تۆمەتی زینا بخاتە پاڵی، ئەم بۆی نیە لە بەرامبەردا بڕوا شایەتی درۆ بـدات لە دژی یان بڕوا بە درۆوە تۆمەتی زینای بداتە پاڵ».

هەروەها باسی سـنگفراوانی خۆیـان بـۆ دەكـات لەگـەڵ نەیارەكانیـدا، ئەڵێ[2]: «ومن سنگفراوانم بەرامبەر هەمو ئەوانەی نەیاری منن، بـا سـنوری خواش بشكێنێ دەرحەقم بە تەكفیركردنم یان تەفسیق كردنم یا درۆهەڵواسـین بە دەممەوە یا دەمارگیری نەفامانە بكا لە دژم، بەڵام من سـنوری خـوای لـە ئاست نابەزێنم، بەڵكو زەبتی ئەو قسە وكردارانە ئەكەم كە ئـەنجامی دەدەم، وبە تەرازوی دادگەری دەیپێـوم، ووای لێدەكـەم شـوێنی قورئـان وسـوننەت بكەوێ وبەگوێرەی ئەوان ئەیكەم».

هەروەها باسی ئەوەش دەكات ئەمەی دەیكا لە نەرمونیانی بریتیـە لـە مەنهەجی سەلەفی ساڵح، وەك ئـەڵێ[3]: «هەربۆیـە ئـەهلی علـیم وسـوننەت هەركەس دژیان بێت تەكفیری ناكەن، بـا ئـەو نـەیارەش تـەكفیریان بكـات،

---

(١) «الاستغاثة» (ص٢٥٤).
(٢) «مجموع الفتاوى» (٢٤٥/٣).
(٣) «الاستغاثة في الرد على البكري» (ص٢٥٢).

چونکە کوفر حوکمێکی شەرعیە وبۆ مـرۆڤ نیـە بـە هاوشـێوە خـۆی سـزای لەسەر بدات [واتە: کەسێ بلێ کافر، حەرامە بلێی: واللە خـۆت کـافری، یـا بلێ: موبتدیع تۆش بلێی: خۆت مبتـدیعی، یـا بلـێ: فاسـق، بلێـی، خـۆت فاسقی]، وەك ئەوەی کەسـێك درۆت بـە دەمـەوە بکـات یـان زینـا لەگـەڵ خێزانەکەت بکات، بۆت نیـە درۆی بـە دەمـەوە بکـەیت یـان زینـا لەگـەڵ خێزانەکەی بکـەی، چـونکە درۆ وزینـا حـەرامن وهـەقی خوایـان لەسـەرە، بەهەمان شێوە تەکفیر هەقی خوایە ونابێت کەس کافر بکرێت مەگەر یەکێك خوا وپەیامبەرەکەی تەکفیری بکات)).

ئەی خوێنەری بەڕێز! تەماشای سنگفراوانی ولێبوردەیی ئەو پیاوە بکە.

## هەڵوێستی ئیبن تەیمیە بەرامبەر شێخ محمدی ئەخنائی

ئەم کتێبێـك دەنوسـێت وتێیـدا قسـەی زۆر بـە ئـیبن تەیمیـە دەکـات، شێخیش کتێبێك لە وەڵامیدا دەنوسێت، لە ل ٩ تەحقیقەکەی «محمد حامد الفقي» ئەڵێ: «ورأيت كلامه، يدل على أن عنده نوعًا من الدين كما عند كثير من الناس نوع من الدين». واتە: ((وقسـەکانیم بـینی، بەڵگـەن لەسـەر ئەوەی خاوەنەکەی جۆرە دینداریەکی تێدایـە وەك چـۆن لای زۆربـەی خـەڵك هەیە)).

وله ل ١٥١ كه باسى هەندێك جوێن وقسەی ناشيرينى ئەخنائى دەكـات پێى وتوە، شێخ ئەڵێ: ئەم شتانه زانستى نين تا وەڵامـى بدەمـەوە ئەگـەرنا مرۆڤ دەتوانێت لەوەی ئەو زياتريش بڵێ ولەوانەيە درۆش نەكات.

## هەڵوێستى ئيبن تەيميه بەرامبەر ئەو كەسانەى داواى زيندانيكردن وكوشتنيان كرد

ئيبن تەيميه به ڕەحمەت بێ دوژمنەكانى جۆراوجۆر بون، بەڵام هاوتەمـەن وهاوپيشەی بون بەشێكى بەهۆى حەسوديەوە بو، دەيان بـينى خـەڵك چـەند خۆشى دەوێت وچـەند خـاوەن زانسـت وڕەوشـت وسـينه سـافه، سـەرەتاش هەوڵەكان بۆ خستنى عەقيدەى ئيبن تەيميه دەستى پێكرد، چـەندين جـاريش دانيشتن كرا لـەو بـارەوە، بـەڵام لـە هـەمو جارەكانـدا ئيفلاسـيان دەهێنـا وبەرگەی بەڵگەكانى ئيبن تەيميەيان نەدەگرت.

وەك بەززار بۆمان باسدەكات ئەڵێ: «وَلما رَأَوْا هَذَا الإِمَام عَالم الْآخِرَة، تَارِكًا لما هم عَلَيْهِ من تَحْصِيل الحطام من الشّبَه الْحَرَام، رافضا الْفضل الْمُبَاح فضلا عَن الْحَرَام، تحققوا أن أحواله تفضح أحوالهم وتوضح خفي أفعالهم، وأخذتهم الْغيرَة النفسانية على صفاتهم الشيطانية المباينة لصفاته الروحانية، فحرصوا على الفتك بِهِ أَيْن مَا وجدوه..». واتە: كه بينيـان ئـەو ڕو له ئاخيرەته وئەمانيش ڕو له دونيا وزانيان چارى ناكەن ودەرەقەتى نايـەن له زانست ئەوسا هەوڵى لەناوبردنيان دا.

هەروەها ئـیبن فـەزڵی عومـەری ئـەڵێ: «.. فَلَقَد اجْتمع عَلَيْهِ عصب الْفُقَهَاء والقضاة بِمصْر وَالشَّام وحشدوا عَلَيْهِ بخيلهم ورجلهم فَقطع الْجَمِيع وألزمهم بالحجج الواضحات أَي إِلْزَام فَلَمَّا أفلسوا اخذوه بالجاه والحكام وَقد مضى ومضوا الى الْملك العلام ﴿ليجزي الَّذين أساؤوا بِمَا عمِلُوا وَيجْزِي الَّذين أَحْسنُوا بِالْحُسْنَى﴾». واتـە: «زۆرێکـی دادوەران وفوقەهاکان لە میسر وشام لێی کۆبونەوە وهەرچیان لە توانـادا بـو لـە دژی بەکاریان هێنا، بەڵام هەرچی بەڵگەیان هەبو وەڵامی دایـەوە وبـە کۆمـەڵێك بەڵگەی ڕون ئیلزامی کردن، کە ئیفلاسیان هێنـا ئەوسـا دەسـتیان کـرد بـە پیلان گێڕی ودژایەتیکردنی».

جا هەوڵی زۆری لە دژ درا، زیندانیکرا، سزا درا، لێی درا، نارەحەتکرا، بەڵام خۆڕاگر بو وئارامی گرت، هەر خۆشی نەگرتەوە بەڵکو سەری کێشا بـۆ قوتابی ودۆستەکانی. وڕوبەروی هەمو جۆرەکانی توندوتیژی کرانەوە.

وەك ئـیبن عەبـدولهادی ئـەڵێ: «وأُوذِي جَماعَةٌ مِن أَصْحابه، واخْتَفَى آخَرُون، وعُزِّر جماعةٌ ونُودي عَليهم». واتـە: «وکۆمـەڵێك لـە هـاوەڵان وقوتابیـان ودەور وبەرەکـەی سـزا دران، وکۆمـەڵێکیش خـۆی شـاردەوە، وکۆمەڵێکیشیان تەمبێ کران وسزا دران وناویان خوێندرایەوە»[1].

(١) «العقود الدرية» (ص٣٤٦).

وزەهەبی باسی جەمال ئەلدین سکەندەری دەکات کە قوتابی ئیبن تەیمیە بوە، ئەڵێ[1]: «أُوذِي مِن أَجْل ابْن تَيْمِية وَقُطِع رِزْقُه وبالَغُوا فِي التَّحْرِير عَلَيْهِ ثمَّ انصلح حَاله». واتە: «ولە پێناو ئیبن تەیمیە ئازاری زۆر درا وموچە وبودجەی بڕدرا».

دەرونی دوژمنەکانی بەمە ئاسودە دەبو، ئەمیش بە گەردن ئازاد کردنیان، بەڵکو لەگەڵ براکەی لە زیندان بون، ئەو هەمو ستەمەی بینی، دوعای شەڕی تێکردن، ئەویش وتی: نەخێر دوعای شەڕیان لێ مەکە، بڵێ: «اللهم هب لهم نورًا يهتدون به». واتە: «خوایە گیان! ڕوناکیەکیان پێ ببەخشە هیدایەتی پێ وەربگرن»[2].

ویستیان زیندانی بکەن تا لە خەڵك دور بکەوێتەوە وکاریگەری کەم ببێتەوە، بەڵام خەڵك بۆ پرسیار ڕویان دەکردە زیندان وکێشەکانیانی چارەسەر دەکردن، وهەروەها ئەو زیندانی کردنەی سۆزی خەڵکی جوڵاند، کە قازی ئیبن مەخلوف ئەوەی بینی زۆر توڕە بو، نامەیەکی نوسی بۆ دەسەڵاتداران، کە: «يَجِبُ التَّضْيِيق عَلَيْه إِنْ لَم يُقْتَل، وإِلَّا فَقَدْ ثبت كفرُه»[3]، واتە: «پێویستە بەری لێ تەسك بکرێتەوە زیاتر ئەگەر نەکوژرێت، وەگەرنا کافرێتی ئەم کەسە چەسپاوە».

(١) «الرد الوافر» (ص١٨٤).
(٢) بڕوانە: « «الجامع لسيرة شيخ الإسلام» (ص٤٧٤).
(٣) بڕوانە: « «الجامع لسيرة شيخ الإسلام» (ص٦٥٢).

وئیبن عدلان داوای کوشتنی کرد وەکو تەمبێکردنی توند[١].

هەروەها زەهەبی ئەڵێ[٢] -پێشتریش باسکرا-: «لە نێوان ئەو ونەیارەکانیدا چەندین هێرش وپەلامار ڕویدا لە شام ومیسر، چەند جار لێی کۆ دەبونەوە ودەستیان تێکەڵ دەکرد بەڵام خوای گەورە دەیپاراست، چونکە پیاوێك بو دوعا وپاڕانەوەی زۆر بو، زۆر ئەکڕوزایەوە، زۆر داوای کۆمەکی دەکرد، پشتقایم بو بەخوا، زۆر لێهاتو وزیرەك بو، کۆمەڵی ویرد وزیکری هەبو تێکەڵی دەکرد بۆ خۆی دەیخوێند، .. هەروەها خەڵکی عەوام خۆشیان دەویست چونکە خۆی تەرخانکردبو بۆ سودپێگەیاندیان بە شەو وڕۆژ بە زمان وپێنوسەکەی».

ئیتر کە بینی فیتنەکە گەورەتر دەبێت، دۆستەکانیشی بەرامبەر نەیارەکانی ڕوبەرو دەبنەوە، ودوژمنەکانیشی وازناهێنن وفیتنەبازن، ڕێگری لەمە کرد ونەیهێشت.

وەك ئەڵێ[٣]: «وَكَانَ مِنْ مُدَّةٍ لَمَّا كَانَ الْقَاضِي حُسَامُ الدِّينِ الْحَنَفِيُّ مُبَاشِرًا لِقَضَاءِ الشَّامِ، أَرَادَ أَنْ يَحْلِقَ لِحْيَةَ هَذَا الأذرعي وَأَحْضَرَ الْمُوسَى وَالْحِمَارَ لِيَرْكَبَهُ وَيَطُوفَ بِهِ، فَجَاءَ أَخُوهُ عَرَّفَنِي ذَلِكَ، فَقُمْت إلَيْهِ وَلَمْ أَزَلْ بِهِ حَتَّى كَفَّ عَنْ ذَلِكَ. وَجَرَتْ أُمُورٌ لَمْ أَزَلْ فِيهَا مُحْسِنًا إلَيْهِمْ، وَهَذِهِ الْأُمُورُ لَيْسَتْ مِنْ فِعْلِي وَلَا فِعْلِ أَمْثَالِي، نَحْنُ إنَّمَا نَدْخُلُ فِيمَا يُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ

(١) بڕوانە: « «الجامع لسيرة شيخ الإسلام» (ص٤٧٤).
(٢) «الرد الوافر على من زعم أن من سمى ابن تيمية شيخ الإسلام كافر» (ص٧١).
(٣) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٧١).

وَالْمُؤْمِنُونَ، لَيْسَ لَنَا غَرَضٌ مَعَ أَحَدٍ، بَلْ نَجْزِي بِالسَّيِّئَةِ الْحَسَنَةَ وَنَعْفُو وَنَغْفِرُ... وَأَنَا وَاَللَّهِ مِنْ أَعْظَمِ النَّاسِ مُعَاوَنَةً عَلَى إطْفَاءِ كُلِّ شَرٍّ فِيهَا وَفِي غَيْرِهَا وَإِقَامَةِ كُلِّ خَيْرٍ، وَابْنُ مَخْلُوفٍ لَوْ عَمِلَ مَهْمَا عَمِلَ وَاَللَّهِ مَا أَقْدِرُ عَلَى خَيْرٍ إلَّا وَأَعْمَلُهُ مَعَهُ وَلَا أُعِينُ عَلَيْهِ عَدُوَّهُ قَطُّ. وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إلَّا بِاَللَّهِ. هَذِهِ نِيَّتِي وَعَزْمِي، مَعَ عِلْمِي بِجَمِيعِ الْأُمُورِ. فَإِنِّي أَعْلَمُ أَنَّ الشَّيْطَانَ يَنْزَغُ بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَلَنْ أَكُونَ عَوْنًا لِلشَّيْطَانِ عَلَى إخْوَانِي الْمُسْلِمِينَ. وَلَوْ كُنْت خَارِجًا لَكُنْت أَعْلَمُ بِمَاذَا أُعَاوِنُهُ، لَكِنَّ هَذِهِ مَسْأَلَةٌ قَدْ فَعَلُوهَا زُورًا وَاَللَّهُ يَخْتَارُ لِلْمُسْلِمِينَ جَمِيعِهِمْ مَا فِيهِ الْخِيَرَةُ فِي دِينِهِمْ وَدُنْيَاهُمْ. وَلَنْ يَنْقَطِعَ الدَّوْرُ وَتَزُولَ الْحَيْرَةُ إلَّا بِالْإِنَابَةِ إلَى اللَّهِ وَالِاسْتِغْفَارِ وَالتَّوْبَةِ وَصِدْقِ الِالْتِجَاءِ. فَإِنَّهُ سُبْحَانَهُ لَا مَلْجَأَ مِنْهُ إلَّا إلَيْهِ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إلَّا بِاَللَّهِ».

واته: «ووالله من له زۆرترین ئەو کەسانەم کە هاوکارن بۆ خامۆشکردنی ئاگری فیتنە وشەڕ، وچەسپاندنی چاکە وخێر، وئیبن مەخلوفیش -هەرچی کردبێت وبکا- والله هەر خێرێکم پێ بکرێت لە ئاستیدا ئەنجامی دەدەم ودەستی هاوکاری بۆ درێژ ئەکەم، وهەرگیز یارمەتی دوژمنەکەی نادەم لە دژی، ولا حول ولا قوە إلا بالله، ئەمە نیاز ومەبەست وبڕیاری منە وسورم لەسەر ئەمە، ئاگاداری هەمو شتەکانیشم، چونکە من ئەزانم شەیتان کێشە وڕق وکینە ئەخاتە بەینی ئیماندارانەوە، وهەرگیز نابمە یارمەتیدەری شەیتان لە دژی برا موسڵمانەکەم».

هەروەها نامەیەك ئەنوسێ بۆ قوتابی وشوێنکەوتوەکانی هانیان ئەدا لەسەر یەکڕیزی موسڵمانان تا ئوممەتی موحەممەد پەرتەوازە نەبێت،

ئەفەرمویٚ(١): «فَتَعْلَمُونَ -رَضِيَ اللَّهُ عَنْكُمْ- أَنِّي لَا أُحِبُّ أَنْ يُؤْذَى أَحَدٌ مِنْ عُمُومِ الْمُسْلِمِينَ -فَضْلًا عَنْ أَصْحَابِنَا- بِشَيْءٍ أَصْلًا لَا بَاطِنًا وَلَا ظَاهِرًا وَلَا عِنْدِي عَتْبٌ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ، وَلَا لَوْمٌ أَصْلًا بَلْ لَهُمْ عِنْدِي مِنْ الْكَرَامَةِ وَالْإِجْلَالِ وَالْمَحَبَّةِ وَالتَّعْظِيمِ أَضْعَافُ أَضْعَافِ مَا كَانَ كُلٌّ بِحَسَبِهِ، وَلَا يَخْلُو الرَّجُلُ: إمَّا أَنْ يَكُونَ مُجْتَهِدًا مُصِيبًا، أَوْ مُخْطِئًا، أَوْ مُذْنِبًا. فَالْأَوَّلُ: مَأْجُورٌ مَشْكُورٌ. وَالثَّانِي مَعَ أَجْرِهِ عَلَى الِاجْتِهَادِ: فَمَعْفُوٌّ عَنْهُ مَغْفُورٌ لَهُ. وَالثَّالِثُ: فَاَللَّهُ يَغْفِرُ لَنَا وَلَهُ وَلِسَائِرِ الْمُؤْمِنِينَ. فَنَطْوِي بِسَاطَ الْكَلَامِ الْمُخَالِفِ لِهَذَا الْأَصْلِ. كَقَوْلِ الْقَائِلِ: فُلَانٌ قَصَّرَ فُلَانٌ مَا عَمِلَ فُلَانٌ أُوذِيَ الشَّيْخُ بِسَبَبِهِ فُلَانٌ كَانَ سَبَبَ هَذِهِ الْقَضِيَّةِ فُلَانٌ كَانَ يَتَكَلَّمُ فِي كَيْدِ فُلَانٍ. وَنَحْوَ هَذِهِ الْكَلِمَاتِ الَّتِي فِيهَا مَذَمَّةٌ لِبَعْضِ الْأَصْحَابِ وَالْإِخْوَانِ. فَإِنِّي لَا أُسَامِحُ مَنْ أَذَاهُمْ مِنْ هَذَا الْبَابِ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إلَّا بِاَللَّهِ. بَلْ مِثْلُ هَذَا يَعُودُ عَلَى قَائِلِهِ بِالْمَلَامِ إلَّا أَنْ يَكُونَ لَهُ مِنْ حَسَنَةٍ وَمِمَّنْ يَغْفِرُ اللَّهُ لَهُ إنْ شَاءَ، وَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَمَّا سَلَفَ.

وَتَعْلَمُونَ أَيْضًا: أَنَّ مَا يَجْرِي مِنْ نَوْعِ تَغْلِيظٍ أَوْ تَخْشِينٍ عَلَى بَعْضِ الْأَصْحَابِ وَالْإِخْوَانِ: مَا كَانَ يَجْرِي بِدِمَشْقَ وَمِمَّا جَرَى الْآنَ بِمِصْرِ فَلَيْسَ ذَلِكَ غَضَاضَةً وَلَا نَقْصًا فِي حَقِّ صَاحِبِهِ وَلَا حَصَلَ بِسَبَبِ ذَلِكَ تَغَيُّرٌ مِنَّا وَلَا بُغْضٌ. بَلْ هُوَ بَعْدَ مَا عُومِلَ بِهِ مِنْ التَّغْلِيظِ وَالتَّخْشِينِ أَرْفَعُ قَدْرًا وَأَنْبَهُ ذِكْرًا وَأَحَبُّ وَأَعْظَمُ وَإِنَّمَا هَذِهِ الْأُمُورُ هِيَ مِنْ مَصَالِحِ الْمُؤْمِنِينَ الَّتِي يُصْلِحُ اللَّهُ بِهَا بَعْضَهُمْ بِبَعْضِ فَإِنَّ الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْيَدَيْنِ تَغْسِلُ إحْدَاهُمَا الْأُخْرَى».

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٢٨/٥٢-٥٣).

واتە: «ئەوەی پەیوەستە بەمنەوە، ئێوە -خوا لێتان ڕازی بێت- ئەزانن من حەزناکەم بە هیچ شێوەیەك یەك موسڵمان -چ جای کەسێ لە دۆستانمان- ئازاری پێبگا نە بە ئاشکرا ونە بە نهێنی، وگلەیشم لە کەسیان نیە، بەڵکو ڕێز وگەورەیی وحورمەتی زۆریان لام هەیە، وهیچ کەسێك بەدەر نیە لە یەکێك لەم سیانە: یا موجتەهیدە وپێکاویتی، یا نەیپێکاوە، یا تاوانبارە. یەکەم بێت؛ پاداشت ئەدرێتەوە وسوپاس دەکرێت، دووەم؛ لەگەڵ پاداشتی ئیجتهادەکەی خوا لێی ئەبورێت، ئەگەر سێیەم بێت؛ ئەوا خوا لە ئێمە وئەویش ببورێت، ئیتر مەڵێن: فلان کەمتەرخەم بو، فلان وای وت، فلان هۆکاری ئازارەکانی شێخە، فلان هۆکاری ئەم کێشانەیە... وئیمانداران بۆ یەکتر وەك دو دەست وان یەکتر دەشۆن».

هەروەها پێیان ئەڵێ -پێشتریش باسکرا[١]-: «.. جا پێم خۆش نیە تۆڵە لە کەس بکرێتەوە بەهۆی درۆکردنی یان ستەمکردن ودەستدرێژی کردنی لە ئاست من، چونکە من گەردنی هەمو موسڵمانێکم ئازاد کردوە، وحەزم لە خێرە بۆ سەرجەم موسڵمانان، وئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە لە خێر وخۆشی بۆ ئەوانیش پێم خۆشە. وئەوانەشی ستەمیان کردەوە لەلایەن منەوە گەردنیان ئازاد بێت وتەنها هەقی خوای تەعالا دەمێنێتەوە... وئەگەر سوپاسی کەس بکرایە لەسەر کارە خراپەکانی ئەو سوپاسی هەمو ئەوانەم دەکرد بونەتە هۆی ئەم کێشە بەهۆی ئەو خێرە دونیایی وئاخیرەتیانەی

---

(١) «مجموع الفتاوی» (٢٨/٥٥-٥٧).

لێیدەکەوێتەوە، ... ئەوانەشی تاونبـارن داواکـارم لـە خـوای گـەورە لێیـان ببورێت... ئێوەش دەزانن ئەمە ڕەوشتی منە)).

چ سینەیەکی ساف بوە کە ئەم پیاوە هەیبوە! ئەمە چ دڵێکـی پاکـە؟ چ نیەتێکی پاك وچاکە؟ بۆیە ئەڵێین: واللە کەس قسە بـە ئـیبن تیمیـە ناکـات مەگەر نەفام یان هەوا دار.

بەڵام خوای تەعالا نارەحەتی لەسەر کەس تا سەر نەنوسیوە، بۆیە ئەوە ئەبێت ((جاشـنەگیر)) دەسـەڵاتەکەی لـەناو دەچـێت ودەکوژرێـت، ونەسـری المنبجیش دەمرێت، سوڵتان موحەممەد قەلاوون دێتە سـەر تـەخت، ئـەمیش هەرکەس پشتی جاشنەگیری گرتبو سزای دەدا، کە زۆربـەیان دوژمـنی ئـیبن تەیمیە بون.

ئەوەبو قەلاوون ئیبن تەیمیەی لە زینـدان دەرکـرد وکـە گەیشـتە بـەردەم کۆشکەکەی سوڵتان لەبەر پێی هەسـتا وەکـو ڕێزێـك ودەسـتی خسـتە نـاو دەستی چونە ژورەوە بۆلای گەورە زاناکـانی میسـر وشـام کـە پـڕی بـو لـە دوژمنەکانی ئیبن تەیمیە، وقەلاوونیش پـڕ دڵـی لـە شـت بـو بەرامبـەریان، چونکە پشتگیری ((جاشنەگیر)) بون، ئاخر ئەو ئینقلابی کردبو لـە قـەلاوون، ئەمیش شوڕشێکی کرد ودوبارە لەسەر تەخت لایدایەوە، بۆیە ئەیویسـت بـە فەتوای ئیبن تەیمیـە بیانکاتـە زیندانـەوە ولـەناویان بـەرێت چـونکە ئـەمان هۆکاری نەهامەتیەکان بون کە بەسەر ئیبن تەیمیـە دەهـات وتـەکفیریان کـرد وفەتوای کوشتنیان دا.

هەوڵێدا وتەنیا کەوت لەگەڵێدا ویستی شێخ ڕازی بکا بەڵام ڕازی نەبو، بیری هێنایەوە چیان پێکردوە، چیان پێوتوە، فەتوای چیان داوە، حوکمی چیان بەسەرداوە، تەنانەت هەندێك کاغەزی فەتواکانیانی لەسەر ئیبن تەیمیە پیشانی ئیبن تەیمیە دا، بەڵام ئیبن تەیمیە سور بو لەسەر ڕاکەی وسودی نەبو.

با بڕۆینە خزمەت ئیبن کەسیر کە لە زاری ئیبن تەیمیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە چی ڕویداوە[١]: «وَسَمِعْتُ الشَّيْخَ تَقِيَّ الدِّينِ يَذْكُرُ مَا كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ السُّلْطَانِ مِنَ الْكَلَامِ لَمَّا انْفَرَدَا فِي ذَلِكَ الشُّبَّاكِ الَّذِي جَلَسَا فِيهِ، وَأَنَّ السُّلْطَانَ اسْتَفْتَى الشَّيْخَ فِي قَتْلِ بَعْضِ الْقُضَاةِ بِسَبَبِ مَا كَانُوا تَكَلَّمُوا فِيهِ، وَأَخْرَجَ لَهُ فَتَاوَى بَعْضِهِمْ بِعَزْلِهِ مِنَ الْمُلْكِ وَمُبَايَعَةِ الْجَاشْنَكِيرِ، وَأَنَّهُمْ قَامُوا عَلَيْكَ وَآذَوْكَ أَنْتَ أَيْضًا! وَأَخَذَ يَحُثُّهُ بِذَلِكَ عَلَى أَنْ يُفْتِيَهُ فِي قَتْلِ بَعْضِهِمْ، وَإِنَّمَا كَانَ حَنَقُهُ عَلَيْهِمْ بِسَبَبِ مَا كَانُوا سَعَوْا فِيهِ مِنْ عَزْلِهِ وَمُبَايَعَةِ الْجَاشْنَكِيرِ، فَفَهِمَ الشَّيْخُ مُرَادَ السُّلْطَانِ، فَأَخَذَ فِي تَعْظِيمِ الْقُضَاةِ وَالْعُلَمَاءِ، وَيُنْكِرُ أَنْ يَنَالَ أَحَدًا مِنْهُمْ سُوءٌ، وَقَالَ لَهُ: إِذَا قَتَلْتَ هَؤُلَاءِ لَا تَجِدُ بِعْدَهُمْ مِثْلَهُمْ، فَقَالَ لَهُ: إِنَّهُمْ قَدْ آذَوْكَ وَأَرَادُوا قَتْلَكَ مِرَارًا، فَقَالَ الشَّيْخُ: مَنْ آذَانِي فَهُوَ فِي حِلٍّ، وَمَنْ آذَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَاللَّهُ يَنْتَقِمُ مِنْهُ، وَأَنَا لَا أَنْتَصِرُ لِنَفْسِي. وَمَا زَالَ بِهِ حَتَّى حَلُمَ عَنْهُمُ السُّلْطَانُ وَصَفَحَ.

قَالَ: وَكَانَ قَاضِي الْمَالِكِيَّةِ ابْنُ مَخْلُوفٍ يَقُولُ: مَا رَأَيْنَا مِثْلَ ابْنِ تَيْمِيَّةَ، حَرَّضْنَا عَلَيْهِ، فَلَمْ نَقْدِرْ عَلَيْهِ، وَقَدَرَ عَلَيْنَا فَصَفَحَ عَنَّا وَحَاجَجَ عَنَّا. ثُمَّ إِنَّ الشَّيْخَ بَعْدَ اجْتِمَاعِهِ بِالسُّلْطَانِ نَزَلَ إِلَى الْقَاهِرَةِ، وَعَادَ إِلَى بَثِّ الْعِلْمِ وَنَشْرِهِ،

---

(١) «البداية والنهاية» (١٨/٩٤ - ٩٥).

وَأَقْبَلَتِ الْخَلْقُ عَلَيْهِ، وَرَحَلُوا إِلَيْهِ يَشْتَغِلُونَ عَلَيْهِ، وَيَسْتَفْتُونَهُ وَيُجِيبُهُمْ بِالْكِتَابَةِ وَالْقَوْلِ، وَجَاءَتْهُ الْفُقَهَاءُ يَعْتَذِرُونَ مِمَّا وَقَعَ مِنْهُمْ فِي حَقِّهِ، فَقَالَ: قَدْ جَعَلْتُ الْكُلَّ فِي حِلٍّ».

واته: «گوێم له شێخ بو باسی ئەوەی دەکرد له نێوان خۆی وسوڵتاندا چی ڕویداوه کاتێك به تەنیا دانیشون لەلای پەنجەرەکە، وسوڵتان داوای فەتوای لێکردوه بۆ کوشتنی هەندێك له دادوەرەکان بەهۆی ئەو قسانەی کردویانە، وفەتوای هەندێکیانی بۆ دەرهێناوە کە ئەم لابرێ لەسەر تەخت وبەیعەت بە جاشنەگیر بدرێت، وئەوان هێرشیان کردۆتە سەرت وئازاریان داوی، ئیتر زۆر هانی دا بەشکو فەتوایەکی بۆ بدات تا بیان کوژێت، وهۆکاری ڕق لە دڵیەکەشی ئەو هەوڵ وتەقالایە بوە کە داویانە بۆ لابردنی ودانانی جاشنەگیر لە شوێنی، ئیتر شێخ تێگەیشتبو مەبەستی سوڵتان چیە، بۆیە دەستی کردبوە ستایشکردنی قازی وزاناکان، ونکوڵی کردبو لەوەی زیان بە کەسیان بگات.

وپێی وتبو: ئەگەر بیانکوژیت خەڵکی وات دەست ناکەوێتەوە.

ئەویش وتبوی: بەڵام چەند جار عەزیەتیان داوی وویستویانە بتکوژن.

وتی: کێ ئەزیەتی منی داوە گەردنی ئازابێت، ئەوەشی ئازاری خوا وپەیامبەری دابێت ئەوە خوا تۆڵەی لێدەکاتەوە، ومن لەبەر نەفسم تۆڵە ناکەمەوە، ئیتر بەردەوام قسەی بۆ کردبو تا سوڵتان دڵی نەرم بو بو ولێیان خۆشبو.

وقازی مالکیەکان ئیبن مەخلوف ئەیوت: وەکو ئیبن تەیمیەمان نەبینیوە، خەڵکمان لە دژ هاندا، کەچی هیچمان پێنەکرا وچارمان نەکرد وتوانامان نەبو، بەڵام ئەم توانای هەبو بەسەرمانەوە کەچی لێمان بورا وبەرگریشی لێکردین.. پاشان زانا وفوقەهاکان هاتن وداوای لێبوردنیان لێدەکرد، ئەویش وتی: گەردنی هەموتانم ئازاد کردوە».

بەڕاستی دەرونە گەورەکان ئەمە دەتوانن.

هەروەها ئیبن عەبدلهادی ئەفەرموێ: «وَسمعت الشَّيْخ تَقِيّ الدّين ابْن تَيْمِية رَحِمَهُ اللَّهُ يذكر أَن السُّلْطَان لما جلسا بالشباك أخرج من جيبه فَتَاوَى لبَعض الْحَاضِرين فِي قَتله واستفتاه فِي قتل بَعضهم. قَالَ ففهمت مَقْصُوده وَأَن عِنْده حنقا شَدِيدا عَلَيْهِم لما خلعوه وَبَايَعُوا الْملك المظفر ركن الدّين بيبرس الجاشنكير، فشرعت فِي مدحهم وَالثنَاء عَلَيْهِم وشكرهم وَأَن هَؤُلَاءِ لَو ذَهَبُوا لم تَجِد مثلهم فِي دولتك أما أَنا فهم فِي حل من حَقي وَمن جهتي وسكنت مَا عِنْده عَلَيْهِم قَالَ فَكَانَ القَاضِي زيد الدّين ابْن مخلوف قَاضِي الْمَالِكِيَّة يَقُول بعد ذَلِك مَا رَأينَا أتقى من ابْن تَيْمِية لم نبق مُمكنا فِي السَّعْي فِيهِ وَلما قدر علينا عَفا عَنَّا». واتاکەی نزیکە لەوەی پێشوتر.

تەنانەت لێرەدا ئیبن قلاون نوسراوەکان دەر دەکا کە فتوای کوشتن وتەکفیری ئیبن تەیمیەی تێدا بوە، بەڵام هەر لێیان دەبورێت.

بەڕادەیەك لێبوردە بوە، ئیبن مەخلوفی دوژمنی سەرسەختی ئەڵێ: «ما رأيت كريمًا واسع الصدر، مثل ابن تيمية، فقد أثرنا الدولة ضده، ولكنه عفا عنا بعد المقدرة، حتى دافع عن أنفسنا وقام بحمايتنا، وحرضنا عليه فلم

نقدر عليه، وقدر علينا فصفح عنا وحاجج عنا». واتـه: ((كەسـی بـەڕێزی دڵفراوان وسنگفراوانی وەك ئیبن تیمیەم نەبینیوە، دەوڵەتمان وروژاند لـە دژی، بەڵام دوای ئەوەی ئەیتوانی تۆڵـەمان لێبکاتـەوە لێمـان خۆشـبو، تەنانـەت بەرگریشی لێکـردین وپاراسـتمانی، ئێمـە خـەڵکمان لـە دژ هانـدەدا بـەڵام نەمانتوانی، ئەو دەستی گەشتە ئێمـە وتـوانی بـەڵام لێمـان بـورا وبـەرگری لێکردین)).

## هەڵوێستی بەرامبەر مردنی دوژمنەکانی

گومانی تێدا نیە مرۆڤ خۆشحاڵ ئەبێت بە مردنی دوژمنەکانی، وداخـی دڵی دەردەچێت. قسەشی پێدەکات چونکە ئیتر دەسەڵاتی بەرگری نیـە وئـەم زمانی تەڕە وئەویش وشك. بەڵام ئیبن تەیمیە جیاوازە.

ئیبن قەییمی قوتابی ئیبن تەیمیە باسی مەنزیلەتی «الفتوة» دەکـات کـە چیە، ئەڵێ -بە کـورتی-[1]: «مَنْزِلَةُ الْفُتُوَّةِ: هَذِهِ الْمَنْزِلَةُ حَقِيقَتُهَا هِيَ مَنْزِلَةُ الْإِحْسَانِ إِلَى النَّاسِ، وَكَفُّ الْأَذَى عَنْهُمْ، وَاحْتِمَالُ أَذَاهُمْ، فَهِيَ اسْتِعْمَالُ حُسْنِ الْخُلُقِ مَعَهُمْ، فَهِيَ فِي الْحَقِيقَةِ نَتِيجَةُ حُسْنِ الْخُلُقِ وَاسْتِعْمَالِهِ، وَالْفُتُوَّةُ إِنَّمَا هِيَ اسْتِعْمَالُ الْأَخْلَاقِ الْكَرِيمَةِ مَعَ الْخَلْقِ.

وَهَذِهِ مَنْزِلَةٌ شَرِيفَةٌ، لَمْ تُعَبِّرْ عَنْهَا الشَّرِيعَةُ بِاسْمِ الْفُتُوَّةِ بَلْ عَبَّرَتْ عَنْهَا بِاسْمِ مَكَارِمِ الْأَخْلَاقِ، وَأَصْلُهَا عِنْدَهُمْ: أَنْ يَكُونَ الْعَبْدُ أَبَدًا فِي أَمْرِ غَيْرِهِ. [ثم تكلم عن درجات الفتوة] الدَّرَجَةُ الْأُولَى: تَرْكُ الْخُصُومَةِ، وَالتَّغَافُلُ عَنِ

(١) «مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين» (٢/٣٢٣ - ٣٣٣).

الزَّلَّةِ، وَنِسْيَانُ الْأَذِيَّةِ. [و] الدَّرَجَةُ الثَّانِيَةُ أَنْ تُقَرِّبَ مَنْ يُقْصِيكَ، وَتُكْرِمَ مَنْ يُؤْذِيكَ، وَتَعْتَذِرَ إِلَى مَنْ يَجْنِي عَلَيْكَ، سَمَاحَةً لَا كَظْمًا، وَمَوَدَّةً لَا مُصَابَرَةً.

هَذِهِ الدَّرَجَةُ أَعْلَى مِمَّا قَبْلَهَا وَأَصْعَبُ، فَإِنَّ الْأُولَى: تَتَضَمَّنُ تَرْكَ الْمُقَابَلَةِ وَالتَّغَافُلَ. وَهَذِهِ تَتَضَمَّنُ الْإِحْسَانَ إِلَى مَنْ أَسَاءَ إِلَيْكَ، وَمُعَامَلَتَهُ بِضِدِّ مَا عَامَلَكَ بِهِ، فَيَكُونُ الْإِحْسَانُ وَالْإِسَاءَةُ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ خُطَّتَيْنِ. فَخُطَّتُكَ: الْإِحْسَانُ، وَخَطَّتُهُ: الْإِسَاءَةُ، وَفِي مَثْلِهَا قَالَ الْقَائِلُ:

إِذَا مَرِضْنَا أَتَيْنَاكُمْ نَعُودُكُمُ ... وَتُذْنِبُونَ فَنَأْتِيكُمْ وَنَعْتَذِرُ

وَمَنْ أَرَادَ فَهْمَ هَذِهِ الدَّرَجَةِ كَمَا يَنْبَغِي فَلْيَنْظُرْ إِلَى سِيرَةِ النَّبِيِّ ﷺ مَعَ النَّاسِ يَجِدْهَا هَذِهِ بِعَيْنِهَا. وَلَمْ يَكُنْ كَمَالُ هَذِهِ الدَّرَجَةِ لِأَحَدٍ سِوَاهُ. ثُمَّ لِلْوَرَثَةِ مِنْهَا بِحَسَبِ سِهَامِهِمْ مِنَ التَّرِكَةِ.

وَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا قَطُّ أَجْمَعَ لِهَذِهِ الْخِصَالِ مِنْ شَيْخِ الْإِسْلَامِ ابْنِ تَيْمِيَّةَ -قَدَّسَ اللَّهُ رُوحَهُ- وَكَانَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ الْأَكَابِرِ يَقُولُ: وَدِدْتُ أَنِّي لِأَصْحَابِي مِثْلُهُ لِأَعْدَائِهِ وَخُصُومِهِ.

وَمَا رَأَيْتُهُ يَدْعُو عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ قَطُّ، وَكَانَ يَدْعُو لَهُمْ.

وَجِئْتُ يَوْمًا مُبَشِّرًا لَهُ بِمَوْتِ أَكْبَرِ أَعْدَائِهِ، وَأَشَدِّهِمْ عَدَاوَةً وَأَذًى لَهُ. فَنَهَرَنِي وَتَنَكَّرَ لِي وَاسْتَرْجَعَ. ثُمَّ قَامَ مِنْ فَوْرِهِ إِلَى بَيْتِ أَهْلِهِ فَعَزَّاهُمْ، وَقَالَ: إِنِّي لَكُمْ مَكَانَهُ، وَلَا يَكُونُ لَكُمْ أَمْرٌ تَحْتَاجُونَ فِيهِ إِلَى مُسَاعَدَةٍ إِلَّا وَسَاعَدْتُكُمْ فِيهِ، وَنَحْوَ هَذَا مِنَ الْكَلَامِ، فَسُرُّوا بِهِ وَدَعَوْا لَهُ، وَعَظَّمُوا هَذِهِ الْحَالَ مِنْهُ، فَرَحِمَهُ اللَّهُ وَرَضِيَ عَنْهُ. [و] الدَّرَجَةُ الثَّالِثَةُ أَنْ لَا تَتَعَلَّقَ فِي السَّيْرِ بِدَلِيلٍ، وَلَا تَشُوبَ إِجَابَتَكَ بِعِوَضٍ، وَلَا تَقِفَ فِي شُهُودِكَ عَلَى رَسْمٍ».

به پوختی واته: «ئەم مەنزیلەتە بریتیە لە چاك بون لەگەڵ خەڵك وئـازار نەدانیان وتەحـەمولكردنی ئازاریـان، بـە كـورتی واتـە: ڕەوشـت بـەرز بـی لەگەڵیان، لە شەرعیشدا بـەم نـاوە «الفتوة» نـەهاتوە، بـە ڕەوشـت بـەرزی هاتوە، ئەم مەنزیلەتە ئەبێتـە سـێ بەشـەوە: وازهێنـان لـە دەمـەدەم وخـۆ بێئاگاكردن لە هەڵە ولەبیر خۆ بردنەوەی ئازار.

دووەم: نزیكردنەوەی ئەوەی دورت دەخاتەوە، وڕێزگرتن لـەوەی ئـازارت دەدات، وداوای لێبـوردن كـردن لـەوەی سـتەمت لێـدەكات لەبـەر بـەڕێزی ولێبوردەیی خۆت. وئـەم مەنزیلەتـە لـەوەی پێشـو گـەورەترە وگرانتریشـە، چونكە ئەو خراپە دەكات تۆ چاكە، وهەركەسیش حەز دەكا لـەم پلـە حـاڵی ببێ با تەماشای سیرەی پەیامبەری خوا بكا، خودی ئەمە دەبینێتەوە.

وكەسم نەبینیوە هەمو ئەم سـیفەتانەی لـە خۆیـدا كـۆ كردبێتـەوە وەك شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیە -خوا ڕوحی پیرۆز بكـات- تەنانـەت هەنـدێك لـە هاوڕێ گەورەكانی ئەیوت: **خۆزگە من بـۆ دۆسـتەكانم وەكـو ئـیبن تیمیـە بوایەم بۆ دوژمنەكانی.** هەرگیز نەمبینیوە دوعای شەڕ لە كەسیان بكـات، بەڵكو دوعای خێری بۆ ئەكردن.

ڕۆژێك هاتم بە دڵخۆشیەوە موژدەی مردنی یەكێك لـە دوژمنـە گـەورە وسەرسەختەكانیم بۆ هێنا كە زۆر دژایەتی ئـەمی ئـەكرد وزۆرتـرین ئـازاری دەدا، بەڵام چو بە گژمدا وپێی ناخۆش بو، ووتی: «**إنا لله وإنا إليه راجعون**»، پاشان یەكسەر هەستا چو بـۆ مـاڵ كەسـوكارەكەی وسەرەخۆشـی لێكـردن،

ووتی: مـن لـە جێـی ئـەوم بۆتـان، وەهەرچـیتان پێویسـت بێـت بێگومـان یارمەتیتان ئەدەم -قسەیەکی ئا لـەو شـێوەی کـرد-، ئـەوەبو زۆریـان پـێ خۆشبو ودوعای خێریان بۆ کرد، وئەم شتەیان زۆر پـێ گـەورە بـو، ڕەحمـەت وڕەزای خوای لێبێ».

## میهرەبانی ئیبن تەیمیە بەرامبەر سەرجەم موسڵمانان

ئەم پیاوە بەڕێزە بەرامبەر سەرجەم موسڵمانان بە بەزەیی بوە بە نەیارەکانیشیەوە، ئەوەتا زەهەبی ئەڵێ[1]: «رَأَيْتُ لِلْأَشْعَرِيِّ كَلِمَةً أَعْجَبَتْنِي وَهِيَ ثَابِتَةٌ رَوَاهَا الْبَيْهَقِيُّ، سَمِعْتُ أَبَا حَازِمٍ الْعَبْدَوِيَّ، سَمِعْتُ زَاهِرَ بْنَ أَحْمَدَ السَّرَخْسِيَّ يَقُولُ: لَمَّا قَرُبَ حُضُورُ أَجَلِ أَبِي الْحَسَنِ الْأَشْعَرِيِّ فِي دَارِي بِبَغْدَادَ، دَعَانِي فَأَتَيْتُهُ، فَقَالَ: اشْهَدْ عَلَيَّ أَنِّي لَا أُكَفِّرُ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ؛ لِأَنَّ الْكُلَّ يُشِيرُونَ إِلَى مَعْبُودٍ وَاحِدٍ، وَإِنَّمَا هَذَا كُلُّهُ اخْتِلَافُ الْعِبَارَاتِ. قُلْتُ: وَبِنَحْوِ هَذَا أَدِينُ، وَكَذَا كَانَ شَيْخُنَا ابْنُ تَيْمِيَّةَ فِي أَوَاخِرِ أَيَّامِهِ يَقُولُ: أَنَا لَا أُكَفِّرُ أَحَدًا مِنَ الْأُمَّةِ، وَيَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلَّا مُؤْمِنٌ» فَمَنْ لَازَمَ الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ فَهُوَ مُسْلِمٌ».

«واتە: وتەیەکی ئەبو ئەلحەسەنی ئەشعەریم بینی زۆر پێم جوان بو، وتەکەش چەسپاوە، بەیهەقی دەگێڕێتەوە، ئەڵێ: لە ئەبو حازمی عەبدەویم بیست، لە زاهیری کوڕی ئەحمەدی سەرخەسیم بیست، ئەیوت: کاتێك ئەبو

(١) «سير أعلام النبلاء» (١٥/٨٨).

ئەلحەسەنی ئەشعری گەیشتە سەرەمەرگ لە ماڵی ئێمە بو لە بەغداد، بانگی کردم وچومە خزمەتی، وتی: تۆ شایەت بە لەسەرم من کەس لە ئەهلی قیبلە بە کافر نازانم، چونکە هەمویان یەکخوا ئەپەرستن ودەست بۆ لای یەکخوا بەرز ئەکەنەوە، ئەم شتانە هەموی جیاوازی دەربڕینە «اخْتِلَافُ الْعِبَارَاتِ»، کەسێك قسەیەکی کردوە بەشێوازێك کەسێکی تر بە شێوازێکی تر.

ئەڵێم [واتە: زهەبی]: منیش بڕوام ئا بەمە هەیە.

ومامۆستامان ئیبن تەیمیەش لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنیدا ئەیفەرمو: «من کەس لەم ئوممەتە بە کافر نازانم» وئەیفەرمو: «کەس پارێزگاری ناکا لە دەستنوێژ مەگەر ئیماندار نەبێت»، جا هەرکەس بە دەستنوێژەوە پارێزگاری لە نوێژەکان بکات ئیماندارە».

خوێنەری بەڕێز دوای خوێندنەوەی ئەم دەقانە وبونی چەندینی تری هاوشێوە، کە هەموی ئاماژەمان بە ژمارەی بەرگ ولاپەڕە وساڵی چاپ ونۆرەی چاپ وشوێنی چاپ کردوە ولەگەڵ ناوی لایەنی لە چاپدەر، ویەك وتەم نەگواستۆتەوە مەگەر بە دەستی خۆم بوە لە سەرچاوەکانی ئیبن تەیمیە خۆیەوە بۆ ئەوەی هەڵە ڕو نەدات، مەگەر بە کەمی، ئیتر چۆن بڕوا بە کەسێك دەکەیت بڵێ: ئیبن تەیمیە تەکفیری بوە، یان توندڕەو بوە، یان توندڕەو وتەکفیریەکان فەتواکانیان لەوەوە وەردەگرن، هەروەها هەوڵی تێکدانی یەکڕیزی موسڵمانانی داوە؟!

# وتەی نەرم لەگەڵ نەیاران

ئیبن تەیمیە ئەڵێ: «مَا ذَكَرْتُمْ مِنْ لِينِ الْكَلَامِ وَالْمُخَاطَبَةِ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ: فَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنِّي مِنْ أَكْثَرِ النَّاسِ اسْتِعْمَالًا لِهَذَا، لَكِنَّ كُلَّ شَيْءٍ فِي مَوْضِعِهِ حَسَنٌ، وَحَيْثُ أَمَرَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ بِالْإِغْلَاظِ عَلَى الْمُتَكَلِّمِ لِبَغْيِهِ وَعُدْوَانِهِ عَلَى الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ: فَنَحْنُ مَأْمُورُونَ بِمُقَابَلَتِهِ، لَمْ نَكُنْ مَأْمُورِينَ أَنْ نُخَاطِبَهُ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ. وَمِنْ الْمَعْلُومِ أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنْتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ فَمَنْ كَانَ مُؤْمِنًا فَإِنَّهُ الْأَعْلَى بِنَصِّ الْقُرْآنِ».

واتە: «سەبارەت بەوەی باستان کرد لە نەرمی قسە وگفتوگۆ بە باشترین شێواز؛ ئەوا خۆتان باشدەزانن من لەو کەسانەم کە زۆرترین جار ئەم ئوسلوبە بەکار دەهێنم»[1].

# ڕوحی لێبوردەیی لەلای ئیبن تەیمیە

هەڵبەت ئەم پیاوە نمونەی سینەسافی ودڵپاکیە، وهاوشێوەی زۆر کەمە لە مێژودا، پێشتریش زۆر نمونە وهەڵوێست ووتەی هێنرایەوە کە سەلمێنەری لێبوردەیی ودادگەری وڕاستگۆیی وبەزەیی ئیبن تەیمیەیە کە ئەوەش مەنهەجی سەلەفی ساڵحە:

(١) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٣٢).

بۆ نمونه ئەڵێ[1]: «وَمَعَ هَذَا فَأَهْلُ السُّنَّةِ يَسْتَعْمِلُونَ مَعَهُمُ الْعَدْلَ وَالْإِنْصَافَ وَلَا يَظْلِمُونَهُمْ؛ فَإِنَّ الظُّلْمَ حَرَامٌ مُطْلَقًا .. هتد وتەكانی كە پێشتر باسمان كرد».

واتە: «لەگەڵ ئەوەشدا ئەهلی سوننەت وجەماعەت لەگەڵیاندا [واتە: شیعە] دادگەر ومونصیفن وستەمیان لێناكەن، چونكە ستەم هەمیشە ولەگەڵ هەمو كەسێك ولە هەمو كاتێكدا حەرامە وەك باسمانكرد، بەڵكو ئەهلی سوننەت بۆ هەر یەك لەم تایەفانە باشترە لە خۆیان بەرامبەر یەكتر، لە خۆیان باشترن بۆخۆیان، بەڵكو بۆ شیعە باشتر ودادگەرترن لە خودی شیعە لە نێو خۆیان، تەنانەت ئەمە حەقیقەتێكە خۆیان دانی پیدا ئەنێن، ئەڵێن: ئێوە ئینصافتان زیاترە لەگەڵماندا، وەك لە هەنێكمان بەرامبەر یەكتر ... بێگومان موسڵمانی زانای دادگەر داگەرترە بۆیان وەك لە هەندێكیان بەرامبەر یەكتر».

وئیبن قەییم ئەڵێ[2]: «تەنانەت هەندێك لە هاوڕێ گەورەكانی ئەیوت: خۆزگە من بۆ دۆستەكانم وەكو ئیبن تیمیە بوایەم بۆ دوژمنەكانی. هەرگیزیش نەمبینیوە دوعای شەڕ لە كەسیان بكات، بەڵكو دوعای خێری بۆ ئەكردن».

(١) «منهاج السنة» (١٥٧/٥ - ١٥٨).
(٢) «مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين» (٣٢٣/٢ - ٣٣٣).

هەروەها باسی شەرەف ئەلدینمان کرد برای ئیبن تەیمیە کە ئەبینیٚ زۆر ئەزیەتی ئەدەن، دوعای شەڕی لیٚکردن، ئەمیش وتی: دوعای شەڕ مەکە بەڵکو بڵیٚ: «خوایە گیان! ڕوناکیەکیان پیٚ ببەخشە پیٚی ڕیٚنمایی وەربگرن»[1].

هەروەها باسی ئیبن مەخلوفی نەیاریمان کرد کە شیٚخ ئەڵیٚ: «وئیبن مەخلوفیش -هەر کاریٚکی کردبیٚت وچیش بکا-، والله تا پیٚم بکریٚ لە خیٚردا یارمەتیدەری ئەبم ودەستی هاوکاری بۆ دریٚژ ئەکەم وقەت یارمەتی دەری دوژمنەکەی نابم لەدژی، چونکە شەیتان کیٚشە ئەخاتە نیٚوان موسڵمانەکانەوە بۆیە من نابمە یارمەتی دەری شەیتان لەسەر برا موسڵمانەکەی خۆم، ئەمە نیاز ومەبەست وبڕیاری منە وسورم لەسەر ئەمە، ئاگاداری هەمو شتەکانیشم»[2].

هەروەها ئەڵیٚ[3]: «وَجَرَتْ أُمُورٌ لَمْ أَزَلْ فِيهَا مُحْسِنًا إِلَيْهِمْ، وَهَذِهِ الْأُمُورُ لَيْسَتْ مِنْ فِعْلِي وَلَا فِعْلِ أَمْثَالِي، نَحْنُ إِنَّمَا نَدْخُلُ فِيمَا يُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ، لَيْسَ لَنَا غَرَضٌ مَعَ أَحَدٍ، بَلْ نَجْزِي بِالسَّيِّئَةِ الْحَسَنَةَ وَنَعْفُو وَنَغْفِرُ... »» واتە: «تەنانەت بڕیاری سزادان وڕیش تاشین وخستنە سەر گویٚدریٚژیان بۆ دەرچو بو، کە نزیکیٚکان هاتنە لام منیش ڕۆیشتم بۆلای

---

(١) بڕوانە: « «الجامع لسيرة شيخ الإسلام» (ص٤٧٤).
(٢) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٧١).
(٣) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٧١).

دادوەرەکە وقایلم کرد کە شتی وا نەکات، وشتانیێکی تریش ڕویداوە بەردەوام هەر چاکەم لەگەڵ کردون وەڵامی خراپەیانم نەداوەتەوە، ئەم شتانەش لەبەر ئەوەیە خوا وپەیامبەر وموسڵمانان پێیان خۆشە وهیچ مەبەستێکی دونیاییمان نیە، ووەڵامی خراپە بە چاکە ولێبوردەیی ولێخۆشبون دەدەینەوە)).

وهەروەها لە نامەیەکدا کە لە زینداندا ئەینوسێ بۆ هاوڕێ وقوتابیەکانی، ئەڵێ: «فَأَنَا أُحِبُّ لَهُمْ أَنْ يَنَالُوا مِنْ اللَّذَّةِ وَالسُّرُورِ وَالنَّعِيمِ مَا تَقَرُّ بِهِ أَعْيُنُهُمْ وَأَنْ يُفْتَحَ لَهُمْ مِنْ مَعْرِفَةِ اللَّهِ وَطَاعَتِهِ وَالْجِهَادِ فِي سَبِيلِهِ مَا يَصِلُونَ بِهِ إلَى أَعْلَى الدَّرَجَاتِ»[1]. واتە: ((ومن حەزەکەم ئەوان توشی [واتە دوژمنەکانی] خۆشی وسەرفرازی وخۆشگوزەرانی ومورتاحی بن، وهەروەها دەروی ناسینی خوا وگوێڕایەڵی کردنی وجیهاد لە پێناوی خوایایان بۆ بکرێتەوە کە بە هۆیەوە بگەن بە پلە بەرزەکان)).

هەروەها باسێکی ئەو سینە ساف ودڵە پاکەی خۆیمان -بە ویستی خوا- بۆ دەکات کە زیاتر بۆمان ڕون ئەبێتەوە چۆن بوە بەرامبەر سەرجەم موسڵمانان، وەك ئەڵێ[2]: «چونکە من گەردنی هەمو موسڵمانێکم ئازاد کردوە، وحەزم لە خێرە بۆ سەرجەم موسڵمانان، وئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە لە

(١) «مجموع الفتاوى» (٣/٢٧١).
(٢) «مجموع الفتاوى» (٢٨/٥٥-٥٧).

خێر وخۆشی بۆ ئەوانیش پێم خۆشە. وئەوانەشی ستەمیان کردەوە لەلایەن منەوە گەردنیان ئازاد بێت...)).

ئەم سینە سافیە ودڵە پاکەی هەر بەرامبەر موسڵمانان وا نەبوە بەڵکو بەرامبەر جولەکە وگاوورەکانیش میهرەبان ودادگەر بوە:

## ئیبن تەیمیە وجولەکە وگاورەکان

لە نامەیەکدا کە بۆ حاکمی قوبرسی ئەو کاتە ئەینێری، ئەڵێ: «وَنَحْنُ قَوْمٌ نُحِبُّ الْخَيْرَ لِكُلِّ أَحَدٍ وَنُحِبُّ أَنْ يَجْمَعَ اللَّهُ لَكُمْ خَيْرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ؛ فَإِنَّ أَعْظَمَ مَا عُبِدَ اللَّهُ بِهِ نَصِيحَةُ خَلْقِهِ وَبِذَلِكَ بَعَثَ اللَّهُ الْأَنْبِيَاءَ وَالْمُرْسَلِينَ» واتە: ((ئێمە خەڵکێکین حەزمان لە خێرە بۆ هەمو کەسێك وحەز دەکەین خوای گەورە خێری دونیا وئاخیرەت بۆ ئێوەش کۆ بکاتەوە)).

بۆچی ئەم نامە ئەنوسێ؟

کۆمەڵێ بەندکراو لای حاکمی قوبرس بوە کە نەسرانی بوە، ئیبن تیمیە نامەیەکی بۆ ئەنوسێ وداوای ئازادکردنی بەندکراوەکان وجوان مامەڵە لەگەڵکردنیان لێدەکات، وباسی ئەوەشی بۆ ئەکا کە ئەو چۆن بوە بۆ بەندکراوە گاورەکانی لای خۆیان وچۆن نامەی نوسیوە بۆ پادشای تەتەرەکان بۆ ئەوەی بەندکراوە گاورەکانی ژێر دەستیان ئازاد بکەن وبەزەییان پێیاندا بێتەوە، ئەڵێ[1]: «وَمَعَ هَذَا فَإِنَّا كُنَّا نُعَامِلُ أَهْلَ مِلَّتِكُمْ بِالْإِحْسَانِ إلَيْهِمْ وَالذَّبِّ عَنْهُمْ، وَقَدْ عَرَفَ النَّصَارَى كُلُّهُمْ أَنِّي لَمَّا خَاطَبْت التَّتَارَ فِي إطْلَاقِ

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٢٨/٦١٨).

الْأَسْرَى، وَأَطْلَقَهُمْ غازان وقطلو شاه وَخَاطَبْت مَوْلَايَ فِيهِمْ فَسَمَحَ بِإِطْلَاقِ الْمُسْلِمِينَ، قَالَ لِي: لَكِنَّ مَعَنَا نَصَارَى أَخَذْنَاهُمْ مِنْ الْقُدْسِ فَهَؤُلَاءِ لَا يُطْلِقُونَ. فَقُلْت لَهُ: بَلْ جَمِيعُ مَنْ مَعَك مِنْ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى الَّذِينَ هُمْ أَهْلُ ذِمَّتِنَا؛ فَإِنَّا نُفْتِكَهُمْ وَلَا نَدَعُ أَسِيرًا لَا مِنْ أَهْلِ الْمِلَّةِ وَلَا مِنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ. وَأَطْلَقْنَا مِنْ النَّصَارَى مَنْ شَاءَ اللَّهُ، فَهَذَا عَمَلُنَا وَإِحْسَانُنَا وَالْجَزَاءُ عَلَى اللَّهِ، وَكَذَلِكَ السَّبْيُ الَّذِي بِأَيْدِينَا مِنْ النَّصَارَى يَعْلَمُ كُلُّ أَحَدٍ إحْسَانَنَا وَرَحْمَتَنَا وَرَأْفَتَنَا بِهِمْ؛ كَمَا أَوْصَانَا خَاتَمُ الْمُرْسَلِينَ حَيْثُ قَالَ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ..».

واتە: «لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە مامەڵەمان لەگەڵ هاوئاینەکانی ئێوە زۆر چاك بوە وبەرگریمان لێکردون، وگاورەکان هەمویان دەزانن کە من نامەم بۆ تەتارەکان نوسیوە تا بەندکراوەکان ڕزگار بکەن، وغازان وقەتلوشاه ڕزگاریان کردن، ولەبارەیانەوە قسەشم کرد لەگەڵ مەولامدا ئەویش ڕێگەیدا بە ڕزگارکردنی دیلە موسڵمانەکان، بەڵام پێی وتم: بەس کۆمەڵێ دیلی گاورەکانمان لەلایە لە قودسەوە هێناومانن ئەوانە بەرنادرێن، منیش پێم گوت: بەڵکو هەرچیت لەلادایە لە جولەکە وگاورەکان ئەبێت هەمویان بەر بدرێن، ئەوانە لە ئەستۆی ئێمەن ولە ژێر پەیمانی ئێمەن، ویەك دیل نابێت بمێنێتەوە نە لە موسڵمانان ونە لەوانەی لە ژێر پەیمانماندان، ئەوەبو کۆمەڵێکی زۆر لە دیلە گاورەکانمان ئەوەندەی خوا ویستی لێبێت ڕزگار کرد، ئەوە ئیشی ئێمە وچاکەی ئێمە بو، پاداشتەکەشی لەلای خوایە».

پاشان بۆی ئەنوسێ: «هەروەها ئەو خزمەتکارانەی گاورەکان کە لەلامانن هەمو کەسێ ئەزانێ کە چەند چاك وبە ڕەحم ونەرمونیانین

لەگەڵیاندا، وەك چۆن كۆتا پەیامبەر موحەممەد ئامۆژگاری بۆ كردین ئەفەرمویٚ: ..)).

پاشان ئەڵێ[1]: «فَيَا أَيُّهَا الْمَلِكُ كَيْفَ تَسْتَحِلُّ سَفْكَ الدِّمَاءِ وَسَبْيَ الْحَرِيمِ وَأَخْذَ الْأَمْوَالِ بِغَيْرِ حُجَّةٍ مِنْ اللَّهِ وَرُسُلِهِ، ثُمَّ أَمَا يَعْلَمُ الْمَلِكُ أَنَّ بِدِيَارِنَا مِنْ النَّصَارَى أَهْلِ الذِّمَّةِ وَالْأَمَانِ مَا لَا يُحْصِي عَدَدَهُمْ إلَّا اللَّهُ، وَمُعَامَلَتُنَا فِيهِمْ مَعْرُوفَةٌ، فَكَيْفَ يُعَامِلُونَ أَسْرَى الْمُسْلِمِينَ بِهَذِهِ الْمُعَامَلَاتِ الَّتِي لَا يَرْضَى بِهَا ذُو مُرُوءَةٍ وَلَا ذُو دِينٍ!؟ لَسْت أَقُولُ عَنْ الْمَلِكِ وَأَهْلِ بَيْته وَلَا إخْوَتِهِ؛ فَإِنَّ أَبَا الْعَبَّاسِ شَاكِرٌ لِلْمَلِكِ وَلِأَهْلِ بَيْتِهِ كَثِيرًا مُعْتَرِفًا بِمَا فَعَلُوهُ مَعَهُ مِنْ الْخَيْرِ» واتە: ((دەسا ئەی پاشا چۆن خوێن ڕشتن، وژن بە كەنیزەك بردن، ومالٚبردن بە ناڕەوا بە ڕەوا دەزانی، بە بیٚ بەڵگەیەكی خوایی، ئینجا ئایا پاشا نازانیٚ لە شارەكانی ئێمەدا ئەوەندە گاور وئەهلی ئەمانی لێیە بەس خوا ئەزانیٚ چەندن، ومامەڵەشمان لەگەڵیاندا زۆر بەناوبانگە، ئیتر چۆن ئێوە مامەڵەیەك لەگەڵ دیلی موسڵمانادا دەكەن، بە شێوەیەك پیاوی بە شەخسیەت وخاوەن دین بە شتی وا ڕازی نابیٚ؟!)).

(١) «مجموع الفتاوى» (٢٨/٦١٢).

# سوربوونی ئیبن تەیمیە لەسەر یەکێتی ویەکڕیزی موسڵمانان

ئـیبن تەیمیـە نامەیـەك دەنوسـێت لـە زیندانـەوە بـۆ هـاوڕێ وقوتـابی ودۆستەکانی لە دیمەشق، ئـەڵێ[1]: «وَتَعْلَمُونَ أَنَّ مِنْ الْقَوَاعِدِ الْعَظِيمَةِ الَّتِي هِيَ مِنْ جِمَاعِ الدِّينِ: تَأْلِيفَ الْقُلُوبِ وَاجْتِمَاعَ الْكَلِمَةِ وَصَلَاحَ ذَاتِ الْبَيْنِ فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ﴾ وَيَقُولُ: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا﴾ وَيَقُولُ: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ]. وَأَمْثَالُ ذَلِكَ مِنْ النُّصُوصِ الَّتِي تَأْمُرُ بِالْجَمَاعَةِ والائتلاف وَتَنْهَى عَنْ الْفُرْقَةِ وَالِاخْتِلَافِ. وَأَهْلُ هَذَا الْأَصْلِ: هُمْ أَهْلُ الْجَمَاعَةِ كَمَا أَنَّ الْخَارِجِينَ عَنْهُ هُمْ أَهْلُ الْفُرْقَةِ. وَجِمَاعُ السُّنَّةِ: طَاعَةُ الرَّسُولِ. وَلِهَذَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الْحَدِيثِ الصَّحِيحِ الَّذِي رَوَاهُ مُسْلِمٌ فِي صَحِيحِهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: «إنَّ اللَّهَ يَرْضَى لَكُمْ ثَلَاثًا: أَنْ تَعْبُدُوهُ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَأَنْ تَنَاصَحُوا مَنْ وَلَّاهُ اللَّهُ أُمُورَكُمْ». وَفِي السُّنَنِ مِنْ حَدِيث زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ وَابْنِ مَسْعُودٍ - فَقِيهَيْ الصَّحَابَةِ- عَنْ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا فَبَلَّغَهُ إلَى مَنْ لَمْ يَسْمَعْهُ فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ غَيْرِ فَقِيهٍ وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ. ثَلَاثٌ لَا يُغِلُّ عَلَيْهِنَّ قَلْبُ مُسْلِمٍ: إخْلَاصُ الْعَمَلِ لِلَّهِ وَمُنَاصَحَةُ وُلَاةِ الْأَمْرِ. وَلُزُومُ جَمَاعَةِ الْمُسْلِمِينَ فَإِنَّ دَعْوَتَهُمْ تُحِيطُ مَنْ وَرَاءَهُمْ».

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٢٨/٥٢).

واته: «ودەزانن یەکێك لە یاسا کۆکەرەوەکانی دین: ڕاگیرکردنی دڵـەکان ویەکوتەیی وبەین چاکیە، ..وشوێنکەوتوانی ئەم بنەمایە بریتین لە: ئـەهلی سـوننەت وجەماعـەت، وەکـو چـۆن دەرچـوان لێـی بـریتین لـە: ئـەهلی پەرتەوازەیی، وکۆکەرەوەی سوننەتیش بریتیە لە: گوێڕایەڵی پەیامبـەر ﷺ، دەی پەیامبـەر ﷺ ئەفـەرموێ: خـوا ڕازی دەبێـت لێتـان لـە سـێ شـت: بیپەرەستن وهاوبەشی بۆ دانەنێن، ودەست بگرن بە دینی خـواوە وپەرتـەوازە نەبن، وئامۆژگاریتان هەبێت بۆ دەسەڵاتدارەکانتان».

هەروەها ئەڵێ[1]: «وخەڵك دەزانن لە نێوان حەنبەلی وئەشعەریەکان ناتەبایی وناخۆشی هەبو، منیش زۆر سورم لەسەر تەبایی نێوان موسڵمانان

---

(١) «مجموع الفتاوى» (٢٢٨/٣ – ٢٢٩). ئەمەش دەقەکـەی لەبـەر گرنگـی باسـی دەکـەین ولەبـەر درێـژی ئەیخەینـە پـەراوێز: «وَالنَّاسُ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ كَانَ بَيْنَ الْحَنْبَلِيَّةِ وَالْأَشْعَرِيَّةِ وَحْشَةٌ وَمُنَافَرَةٌ. وَأَنَا كُنْت مِنْ أَعْظَمِ النَّاسِ تَأْلِيفًا لِقُلُوبِ الْمُسْلِمِينَ وَطَلَبًا لِاتِّفَاقِ كَلِمَتِهِمْ وَاتِّبَاعًا لِمَا أُمِرْنَا بِهِ مِنْ الِاعْتِصَامِ بِحَبْلِ اللَّهِ وَأَزَلْت عَامَّةَ مَا كَانَ فِي النُّفُوسِ مِنْ الْوَحْشَةِ وَبَيَّنْت لَهُمْ أَنَّ الْأَشْعَرِيَّ كَانَ مِنْ أَجَلِّ الْمُتَكَلِّمِينَ الْمُنْتَسِبِينَ إلَى الْإِمَامِ أَحْمَدَ رَحِمَهُ اللَّهُ وَنَحْوِهِ الْمُنْتَصِرِينَ لِطَرِيقِهِ كَمَا يَذْكُرُ الْأَشْعَرِيُّ ذَلِكَ فِي كُتُبِهِ. وَكَمَا قَالَ أَبُو إسْحَاقَ الشِّيرَازِيُّ: إنَّمَا نَفَقَتْ الْأَشْعَرِيَّةُ عِنْدَ النَّاسِ بِانْتِسَابِهِمْ إلَى الْحَنَابِلَةِ وَكَانَ أَئِمَّةُ الْحَنَابِلَةِ الْمُتَقَدِّمِينَ كَأَبِي بَكْرٍ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَأَبِي الْحَسَنِ التَّمِيمِيِّ وَنَحْوِهِمَا يَذْكُرُونَ كَلَامَهُ فِي كُتُبِهِمْ بَلْ كَانَ عِنْدَ مُتَقَدِّمِيهِمْ كَابْنِ عَقِيلٍ عِنْدَ الْمُتَأَخِّرِينَ، لَكِنَّ ابْنَ عَقِيلٍ لَهُ اخْتِصَاصٌ بِمَعْرِفَةِ الْفِقْهِ وَأُصُولِهِ وَأَمَّا الْأَشْعَرِيُّ فَهُوَ أَقْرَبُ إلَى أُصُولِ أَحْمَدَ مِنْ ابْنِ عَقِيلٍ وَأَتْبَعُ لَهَا فَإِنَّهُ كُلَّمَا كَانَ عَهْدُ الْإِنْسَانِ بِالسَّلَفِ أَقْرَبَ كَانَ أَعْلَمَ بِالْمَعْقُولِ وَالْمَنْقُولِ. وَكُنْت أُقَرِّرُ هَذَا لِلْحَنْبَلِيَّةِ – وَأُبَيِّنُ أَنَّ الْأَشْعَرِيَّ، وَإِنْ كَانَ مِنْ تَلَامِذَةِ الْمُعْتَزِلَةِ ثُمَّ تَابَ، فَإِنَّهُ كَانَ تِلْمِيذَ الجبائي وَمَالَ إلَى طَرِيقَةِ ابْنِ كُلَّابٍ وَأَخَذَ عَنْ زَكَرِيَّا الساجي أُصُولَ الْحَدِيثِ بِالْبَصْرَةِ، ثُمَّ لَمَّا قَدِمَ بَغْدَادَ أَخَذَ عَنْ حَنْبَلِيَّةٍ بَغْدَادَ أُمُورًا أُخْرَى، وَذَلِكَ آخِرُ أَمْرِهِ كَمَا ذَكَرَهُ هُوَ وَأَصْحَابُهُ فِي كُتُبِهِمْ. وَكَذَلِكَ ابْنُ عَقِيلٍ كَانَ تِلْمِيذَ ابْنِ الْوَلِيدِ

ویەکوتەییان ووەك شوێنکەوتنێك بۆ ئەو دەقانەی فەرمان دەکەن بە دەست گرتن بە دینی خوا زۆربەی ئەو ناخۆشی وناتەباییەی هەبو لە نێوانیاندا نەمهێشت، وبۆم ڕونکردنەوە کە ئەشعەری [ئەبولحەسەنی ئەشعەری] یەکێك لە هەرە گەورە پیاوانی ئەهلی کەلام کە دەدرێنە پاڵ ئیمامی ئەحمەد وهاوشێوەکانی لە سەرخەرانی بۆچونەکانی، وەك ئەشعەری خۆی باسی ئەوە دەکات لە کتێبەکانیدا...

ومن لە تەمەنمدا هەتا ئەم ساتەش لە عەقیدەدا کەسم بانگ نەکردوە بۆ مەزهەبی حەنبەلی، وتەنها باسی شتێك دەکەم هەمو سەلەف لەسەری کۆك بوبێتن، وزیاتر لە جارێك پێم وتون: من سێ ساڵ ئەدەمە هەمو ئەوانەی نەیاری منن، سێ ساڵ بۆ ئێوە بەس بیسەلمێنن من هەڵەم ویەك ڕستەم بۆ بهێنن لە سەردەمە زێڕینەکەوە، بەڵێن بێت پەشیمان ببمەوە».

---

وَابْنِ التَّبَّانِ الْمُعْتَزِلِيَّيْن ثُمَّ تَابَ مِنْ ذَلِكَ، وَتَوْبَتُهُ مَشْهُورَةٌ بِحَضْرَةِ الشَّرِيفِ أَبِي جَعْفَرٍ. وَكَمَا أَنَّ فِي أَصْحَابِ أَحْمَدَ مَنْ يُبْغِضُ ابْنَ عَقِيلٍ وَيَذُمُّهُ: فَالَّذِينَ يَذُمُّونَ الْأَشْعَرِيَّ لَيْسُوا مُخْتَصِّينَ بِأَصْحَابِ أَحْمَدَ بَلْ فِي جَمْعِ الطَّوَائِفِ مَنْ هُوَ كَذَلِكَ. وَلَمَّا أَظْهَرْت كَلَامَ الْأَشْعَرِيِّ - وَرَآهُ الْحَنْبَلِيَّةُ - قَالُوا: هَذَا خَيْرٌ مِنْ كَلَامِ الشَّيْخِ الْمُوَفَّقِ وَفَرِحَ الْمُسْلِمُونَ بِاتِّفَاقِ الْكَلِمَةِ. وَأَظْهَرْت مَا ذَكَرَهُ ابْنُ عَسَاكِرَ فِي مَنَاقِبِهِ أَنَّهُ لَمْ تَزَلْ الْحَنَابِلَةُ وَالْأَشَاعِرَةُ مُتَّفِقِينَ إلَى زَمَنِ القشيري فَإِنَّهُ لَمَّا جَرَتْ تِلْكَ الْفِتْنَةُ بِبَغْدَادَ تَفَرَّقَتْ الْكَلِمَةُ وَمَعْلُومٌ أَنَّ فِي جَمِيعِ الطَّوَائِفِ مَنْ هُوَ زَائِغٌ وَمُسْتَقِيمٌ.

مَعَ أَنِّي فِي عُمْرِي إلَى سَاعَتِي هَذِهِ لَمْ أَدْعُ أَحَدًا قَطُّ فِي أُصُولِ الدِّينِ إلَى مَذْهَبٍ حَنْبَلِيٍّ وَغَيْرِ حَنْبَلِيٍّ، وَلَا انْتَصَرْت لِذَلِكَ، وَلَا أَذْكُرُهُ فِي كَلَامِي، وَلَا أَذْكُرُ إلَّا مَا اتَّفَقَ عَلَيْهِ سَلَفُ الْأُمَّةِ وَأَئِمَّتُهَا. وَقَدْ قُلْت لَهُمْ غَيْرَ مَرَّةٍ: أَنَا أُمْهِلُ مَنْ يُخَالِفُنِي ثَلَاثَ سِنِينَ إنْ جَاءَ بِحَرْفٍ وَاحِدٍ عَنْ أَحَدٍ مِنْ أَئِمَّةِ الْقُرُونِ الثَّلَاثَةِ يُخَالِفُ مَا قُلْته فَأَنَا أُقِرُّ بِذَلِكَ».

ئیتر لەوەدوا زۆر نامانێتەوە هەر لە بەندیخانە وەفات دەکات بە ستەملێکراوی، مرد بەڵام بەبێ ئەوەی -إن شاء الله- ڕق وکینە لە دڵ هەبو بێت بەرامبەر موسڵمانان، مرد بەڵام دوای ئەوەی گەردنی هەموی ئازاد کرد. **واللهُ تَعَالى أَعْلى وَأَعْلَم**[1].

ئەمە گوزەرێکی خێرا بو بە هەندێکی کەم لە بوارێکی کەمی ژیانی یەکێك لە کەڵە پیاوەکانی ئیسلام ومرۆڤایەتی، شتی زیاتریش هەبو بەڕاستی لەسەر ژیانی -ڕەحمەتی خوای لێبێ-، بەڵام بێگومان ئەوەندە بەسە بۆ کەسی توێژەر وزانستی وخاوەن ئینساف.

**واللهُ الهَادي وَهُوَ المُوَفِّقُ.**

**علي خان**

**٢٣ سێپتەمبەری ٢٠١٦**

---

(١) بۆ باسی وردەکاری مردنەکەی وئەسەفباری خاصە وعامە بۆ مردنەکەی وچۆنێتی بەڕێکردنی بەرەو گۆڕستان کە نزیکەی پێنج سەد هەزار کەس دوای کەوتوە وجگە لە جەنازەکەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل جەنازە نەبینراوە ئەوەندە خەڵك شوێنی بکەوێت" بڕوانە: «**الأعلام العلية**» (ص٧٣ - ٧٨).

## پێڕستی بابەتەکان

## چاوەڕێی ئەم بەرهەمانە بن إن شاو الله تعالی:

- «الفقه الميسر» بە کوردی. خوای میهرەبان تەواو بونی ئاسان بکا.

- «چرای ڕوناك لە سیرەی پەیامبەری ڕاستگۆی دەستپاك». تەواو بوە، خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات..

- «إتحاف الأخيار عن كيفية صلاة النبـي ﷺ من حيث الإطالة والإختصار». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «تسهيل الرحبية». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «جیاوازی نێوان موسڵمانان، هۆکار وچارەسەر». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «تەبەڕوککردن وجۆرەکانی». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «پەروەردەکردنی منداڵان وبەرپرسیارێتی دایکان وباوکان». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «جیهانی جنۆکەو شەیتانەکان». خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «ڕونکردنەوەی ناوە چاکەکانی خوای گەورە». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «وەفا وئەمەکداری پەیامبەری خوا ﷺ». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «چیرۆکی پەیامبەر یوسف ﷺ لە قورئان وفەرمودەدا». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «ئایا پەیامبەری خوا ﷺ سیحری لیکراوە؟!» تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «گفتوگۆیەکی نەرمونیان لەگەڵ د.عثمان». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «هەڵسەنگاندنی وتەی فەلسەفەخوازێك لە تەرازوی عەقڵ ومەعریفە وواقعدا». «وەڵامی فاروق ڕوفیق». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «نەرمونیانی لە ڕونکردنەوەی ٩٠ هەڵە وچەواشەکاری». «وەڵامی ... ڕاوی» تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «دوعا وپاڕانەوە». تەواو بوە خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «کارەکانی دڵ». خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «نەخۆشیەکانی دڵ». خوای میهرەبان لە چاپدانی ئاسان بکات.

- «ڕۆژهەڵاتناسی ورۆژهەڵاتناسان». «نامیلکە» خوای میهرەبان تەواو بونی ئاسان بکات.

- «داوێن پیسی هۆکارەکانی، کاریگەریەکانی، چارەسەر». خوای میهرەبان تەواو بونی ئاسان بکات.

- «شرح الكبائر» للذهبي. خوای میهرەبان تەواو بونی ئاسان بکا.

- «ڕیبا چیە؟» خوای میهرەبان تەواو بونی ئاسان بکا.

- «أين نحن من أخلاق السلف؟» به كوردی. خوای میهرەبان تەواو بون وله چاپدانی ئاسان بکات.

- «رياض الصالحين». به كوردی. خوای میهرەبان تەواو بون وله چاپدانی ئاسان بکات.

- «ئادابەکانی ئیعتکافکردن» تەواو بوە، خوا له چاپدانی ئاسان بکا.

- «حوكمی وێنەگرتن له فیقهی ئیسلامیدا» تەواو بوه خوای میهرەبان له چاپدانی ئاسان بکات.

- «گۆشتی بەراز خۆشه یان وشتر؟!» «گفتوگۆیەك لەگەڵ مەلا بەختیارس» (نامیلکه) تەواو بوه خوای میهرەبان له چاپدانی ئاسان بکات.

- «ئەمه ئیبن تەیمیەیه» «وەڵامی پلاتفۆرمی دابڕان» تەواو بوه خوای میهرەبان له چاپدانی ئاسان بکات.